# ڕوونكردنەوەیەك لەسەر
# حەدیسی ٧٣ فرقە

محمد رازی



چاپی یەكەم

١٤٣١ك

٢٠١٠ز

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب : ڕوونکردنەوەیەك لەسەر حەدیسی ٧٣ فرقە

نوسینی : محمدی رازی

تایپ و دیزاین: کۆمپیوتەری کازیوە

ساڵی چاپ : ٢٠١٠

نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم

چاپخانە: سیما- سلێمانی

تیراژ : (١٠٠٠)

پێداچوونەوەی: کاوە پێنجوێنی

## پێشەكی :-

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری میهرەبان وە درودی بێ پایان لەسەر پێغەمبەری ئاخر زەمان. ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەسەر یارو یاوەرانی تاكۆتایی ژیان.

خوێنەری بەڕێز: جیاوازی ڕەنگ و ڕاو نەژادو زمان.
جیاوازی هێزو هەوڵو تواناكان. جیاوازی سەلیقە و قابیلەیەتو بەرزو نزمی ژیان. ئاوێتەیە لەسروشتی ژیانی مرۆڤەكان وە بنەمایەكە لەبنەماكانی پێكهاتەی پەیدابوونیان.
وە ئەم جیاوازیانەن كە ژیانیان بەرەوپێش بردووەو بەجیاوازی دروست بوون وە بۆ ئەمەیش دروست بوون، بەدیهێنەریشمان وەها دەفەرمووێت: ﴿ولایزالون مختلفین الامن رحم ربك ولذلك خلقهم﴾.
واتە: بە بەردەوامی جیاواز دەبن مەگەر ئەوەی كە پەروەردگارت بەزەیی پێدابێتەوە. وە هەر بۆ ئەوەیش دروستی كردوون.
وە ئەم جیاوازیە سروشتیانەی كە پەروەردگار بەدیهێناوە لەكیانی مرۆڤەكاندا بۆ پێكەوە ژیانو، گەشەی تواناكان و ئاوەدانی وڵاتو نێوانیان زۆر جار لەگرێژەنەو سكەو تەوەرەی

خودی دەرچووە و دەردەچێت وە دەبێتە کوشتو کوشتار و وێرانکاریی و لەناوبردنی لایەنی بەرانبەر بە بەهانەی خۆبەڕاست و ڕەوا زانین و لایەنی بەرانبەر بەناڕاستو ناڕەوا لەقەڵەمدان. ئەمەیش بە پێوەری خواستو ئارەزووی دنیایی بووە، وە خوای پەروەردگاریش بەهەناردنی پێوەری ڕاستو ڕەواو بە بەهرەمەندی لەجیاوازیەکان پەیامی خۆی ڕەوانەکردوە، وە تا لەسەر جیاوازیەکان لەنێوان خەڵکیدا دادپەروەرانە دادوەری بکات. وەکو دەفەرموێت: ﴿وانزل معهم الکتاب بالحق لیحکم بینهم فیما اختلفوا فیه﴾.

واتە: لەگەڵ ڕەوانەکردنی پێغەمبەران پەیامی هەناردووە تاوەکو دادوەری لەنێوان خەڵکیدا بکات لەسەر ناکۆکیو جیاوازیەکانیان.

بەڵام جولەکە و گاور بەجیاوازیە سروشتیەکەوە نەوەستاون و لەسەر پەیامو پێغەمبەرانی خودا دوبەرەکی کەوتە نێوانیانو لەپاش ئاشنابوونیان بەپەیامی پەروەردگار بەهۆی دڵ پیسی بۆ دنیاپەرەستی و حەسادەتیانەوە لەپێغەمبەران هەڵگەڕانەوە و زیادڕەویان تێداکردو دنیاو دوارۆژیان کردە شەوە زەنگو گۆمی خوێن لەخۆیانو دانیشتوانی سەر زەوی.

وە زۆر بەداخەوە بەگێڕانەوەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی جولەکە دەبنە ٧١ فرقەو گاوریش دەبنە ٧٢

فرقەو ئۆممەتی منیش دەبێتە ٧٣ فرقە کە هەموو لەئاگردان جگە لەیەك فرقەیان نەبێت. کە هەر فرقەو تاقمێك خۆی بەو فرقە ڕزگار بووە بەهەشتیە دەزانێت کە هەمان دەردو ناسۆری دوبەرەکی جولەکەو گاور یەخەی موسڵمانانیشی گرتووەو نزیك یەك سەدەیە موسڵمانانی ژێردەستەو زەلیل و پەرتو پەرتەوازە کردووە کە باس و ڕوونکردنەوەکەی ئێمە لەسەر ئەم فەرمودەی ٧٣ فرقەیە کە: وەڵامی ئەم پرسیارانەن

١- ئایا جیاوازی لەنێوان موسڵمان و جولەکەو گاوردا نییە.

٢-وە ئەو فەرموودەیە تاچەند لەڕووی دەق و گێڕانەوەوە دروستە.

٣-ئەگەر دروستە فیرقەی سەرەفرازو ڕزگاربویان کێن و کامانەن.

٤-ئەگەر هەر ٧٣ فرقەکە ئوممەتی پێغەمبەرن چۆن دەچنە دۆزەخ و ئاگرەوە.

٥-تاچەند ئەم فەرموودەیە لەگەڵ قورئاندا هاوسەنگەو پێك دێت.

٦-بەچەند دەقی جیاواز وە کامیان دروستە؟

٧-ئەو حەفتاو دوفیرقەیە تێپەڕیوون؟ ئێستە هەن؟ وەیان هێشتا نەهاتوون.

٨-ئەحزابی ئیسلامی بەر ئەو حەفتاو سێ فرقە دەکەون یان نا؟

٩-ئەم فەرموودەیە تاچەند لەگەڵ دەقی قورئاندا یەك دەگرێتەوە.
١٠-هەڵوێستی ئێمەی موسڵمان لەم فەرموودەیە چیە و دەبێ چی بکەین؟

کە چەندین ساڵە ئەم فەرموودەیە بووەتە خولیای سەرم کە لەهەر زانایەکم دەپرسی وەڵامێکی وەهای پێ نەبوو کە ئاو ڕشێنی دڵی من بکاو جارێکی تر باسی لێوە نەکەم تا سەرەنجام نامیلکەیەکم لەسەر ئەم فەرموودەیە بەرچاو کەوت کە هانیدام بۆئەوەی ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر بنووسم بەئاواتی ئەوەی دیواری لەمپەری نێوان موسڵمانان بشکێنین و جارێکی تر موسڵمانان بەهەستو سۆزی برایەتی ئیمانی. وە بەیەك دەنگو یەك ڕیزو یەك بەیداخ لەژێر فەرمانی ئیسلامدا بەمەبەستی چەسپاندنی شەریعەتی ئیسلام بەسەر بەرزی و سەرفرازی دنیاو دوارۆژ بگەینەوە، پشت بەخوای پەروەردگار وە چارەسەری کێشەکانمان بکەین بەگەڕانەوەمان بۆلای پەیامی پەروەردگار کە قورئانە.

وە بەیاری خوای گەورە لە ١٠خاڵدا ئەم نامیلکەیە دەخەینە بەردەستی خوێنەران کە چاوپۆشی لەهەڵەکانی مەکەن بەسینگی فراوانەوە لەخزمەتتاندا دەبین وە لەسەر باشەکەیشی لەدۆعای خێر بێ بەشمان مەکەن. وە ئەم نامیلکەیەی بەندە تەرجومەی ئەو نامیلکە نیە کە بەناوی (اضواء علی حدیث افتراق الامة) نوسراوە بەڵام سودی زۆرم لێ وەرگرتووە لەگەڵ چەند سەرچاوەی تردا...

## ((خاڵی یەکەم))

### ئایا جیاوازی لەنێوان موسڵمانان و جولەکەو گاوردا نییە لەچاکەو گەورەییدا کەوا موسڵمانیش بەدەردی جولەکەو گاور دەبنە ٧٣ فرقە؟

لەڕاستیدا بەڵگەی زۆر لەقورئان و فەرموودەدا هەیە کە موسڵمانان لەدنیاو دوا ڕۆژدا لەلای پەروەردگار بەڕێزو گەورەترن وە هیچ کات بەدەردی ئەوان ناچن کە تەنها چەند نمونەیەکیان بە بەڵگە دەهێنینەوە.

<u>یەکەم:</u> ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ لێبوراوو بەخشراون لەلای پەروەردگار وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت {امتی هذه امة مرحومة، ليس عليها عذاب في الآخرة، عذابها في الدنيا الفتن والزلازل والقتل} حديث صحيح اخرجه احمد، وابو داود، والبزار، والحاكم، والبيهقي رقم ٩٧٩٩.

واتە: ئوممەتی من ئەمەیە کە ئوممەتێکی بەخشراوو لێبوراوە و سزای دوا ڕۆژی لەسەرنیە. بەڵکو لەدنیادا سزا دەدرێن بەنەهامەتی و بەلاو، بومەلەرزەو کوشتن.

<u>دووەم:</u> بەدەقی قورئان موسڵمانان گەورەو چاکترو بەرێزترن لەدوو (ئەهلی کتاب) جولەکەو گاور، کە پەروەردگار لەبارەی موسڵمانانەوە دەفەرموێت ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ ال عمران:١١٠ .

واتە: ئێوە موسڵمانان، باشترین و چاکترین گەلن کە لەناو خەڵکیدا وە دەرکەوتون چونکە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە دەکەن و باوەڕتان بەخودا هەیە.

وه لەفەرموودەیەکی تردا گەورەیی موسڵمانان نیشان دەداتو دەیانکاتە شایەتی بۆ خۆی لەسەر تەواوی مرۆڤەکانی دی وەکو دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾البقرة: ١٤٣.

واتە: ئاوەها ئیوەمان گێڕاوە بەگەلێکی میانەڕەو و دادپەروەر تاوەکو شایەتیدەر بن لەسەر خەڵکی. کە وشەی (وسط) مانای دادپەروەریش دەگەیەنێت.

<u>سێهەم</u>: ئوممەتی ئیسلام هەر چەند لەناو ئەهلی شرك دا وەکو تاڵە مویەکی سپی وەهایە لەناو پێستی گایەکی ڕەشدا وەکو پێغەمبەر لەفەرموودەیەکیدا کە امامی بوخاری دەیگێڕتەوە و دەفەرموێت: {وما انتم في اهل الشرك الا كالشعرة البيضاء في جلد الثور الاسود} اخرجه البخاري رقم ٦١٦٣ ومسلم رقم ٣٣١.

واتە: ئێوە نین لەناو بێ باوەڕاندا مەگەر بەئەندازەی مویەکی سپی لەپێستی گایەکی ڕەشدا. بەڵام بەناو ئەهلی بەهەشتدا موسڵمانان نیوەی دانیشتوانی بەهەشتی پێکدەهێنن وە دوو ئەوەندەی جولەکەو گاور لەلای پەروەردگار بەهرەو پاداشتیان هەیە وەکو پێغەمبەری ئیسلامﷺ دەفەرموێت: {عن عبدالله ابن عمر عن رسول الله ﷺ قال: انما مَثلكم ومثل اليهود والنصارى كرجل استعمل عُمّالاً، فقال: من يعمل لي الى نصف النهار على قيراطه ، فعملت اليهود الى نصف النهار على ، ثم قال: من يعمل لي من نصف النهار الى صلاة العصر على، فعملت النصاري من نصف النهار الى صلاة العصر على. ثم قال: من

يعمل لى من صلاة العصر الى المغرب بالشمس على قيراطين، الا لكم الاجر مرتين، فغضبت اليهود والنصارى، فقالو: نحن اكثر عملا واقل عطاءً، قال الله هل ظلمتكم من حقكم شيئاً. قالوا: لا، قال: فانه فضلى اعطيه من شئته} اخرجه البخارى رقم ٢٣٧٣.
واته: له عبدالله ی كوڕی عمرەوه دەگێڕینەوه كه پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی نمونەی ئێوه نمونەی جولەكەو گاور وەكو ئەو پیاوە وەهایە كه چەند كرێكارێك بەكرێ بگرێت و پێیان بڵێت: كێ دەتوانێ لەبەیانیەوه هەتا نیوەڕۆ كارم بۆ بكات لەسەر ئەوەی (قراطة) نیودانگی بدەمێ دوجار كه دانگێك دەكات. جولەكه هەتا نیوەڕۆ كاری بۆ كرد بەو دانگه. پاشان بڵێت: كێ لەسەر دانگێك لەنیوەڕۆوه هەتا نوێژی عەسر كارم بۆ بكات. گاورەكانیش هەتا عەسر ئەو كارەیان بۆ كرد. پاشان بڵێت: كێ لەعەسرەوه هەتا ئێواره ڕۆژ ئاوا دەبێت كارم بۆ بكات لەسەر دوو دانگ و دو دانگ بەڵی ئێوەی موسڵمانان ئەو كەسانە بوون لەسەر چوار دانگ هەتا ڕۆژداچوون كارتان بۆ كرد كه پاداشتی ئێوه دوو بەرانبەر بوو. جولەكەو گاور بەم كاره قەڵسو توڕەبوون وه وتیان: ئێمه كارمان زۆرو پاداشت و بەخششمان كەم بوو. بەڵام پەروەردگار فەرمووی: ئایا لەمافی خۆتان ستەمێكم لێ كردوون. وتیان نەخێر خوایش فەرمووی ده ئەوه گەورەیی ڕێزی خۆمه دەیدەم بەهەر كەسێك كه ئارەزووم بێت. پێشەوا بوخاری ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوه...

چوارەم: بەفەرموودەی پێغەمبەری ئیسلام خوای گەورە بورراوە لەو هەڵەو تاوانانەی کە ئوممەتی من بەنەزانی وە یان لەبیرچوونەوە یان بەزۆرە ملیّ کردوویانە و پێی دەکەن. وەکو دەفەرموێت: {ان الله تجاوز عن امتی الخطأ والنسیانَ وما استکرهوا علیه} اخرجه ابن حبان وقال الحاکم صحیح علی شرط الشیخین.
واتە: بەڕاستی خوای گەورە تۆڵە و سزا لە ئوممەتم ناسێنێت لەسەر گوناهێك کە بەهەڵە و لەبیرچونەوە و زۆرەملیّ کردبێتی.

پێنجەم: پەیامی ئیسلام کە قورئانە لەپەیامەکانی پێشوو گەورەترەو گشتگیرترە کە بۆ هەموو ئادەمیزاد و جنۆکە ڕەوانەکراوە بەبیّ جیاوازی بەلاّم ئەوان هەریەکە بۆ گەلێکی تایبەتی ڕەوانەکراون. وە پێغەمبەری ئیسلام لەهەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی گەورەترە و بۆ هەموو بەشەریەتەو خاوەنی پلەی بەرزو تکاکاری گەورەیە لەرۆژی قیامەتدا و گەورەی نەوەی ئادەمەو یەکەم کەسێکە کە دەرگای بەهەشت دەکاتەوە.
جا خوێنەری بەڕێز بەوردی لەم پێنج نمونەیە وردبەرەوە ئایا ڕەوایە کە ئوممەتی ئیسلام لەترازانو پەرتبووندا فرقەیەکی لەوان زیاتر بێت و تاوانێك لەوان زیاتر بکات بەلاّم سزای لەجولەکەو گاور کەمتر بێت وە ڕێزو گەورەیشی لەوان زیاتر بێت؟ کە بێگومان ئەمە لەدادپەروەری پەروەردگارەوە دوورە. کەوا دەزانم هەر ئەم پێنج نمونەیە بەسە بۆئەوەی کە ئەو فەرمودەیەی (٧٣) فرقەیە بکەوێتە ژێر پرسیارو لێکۆڵینەوەوە کە ئێمە زیاتر بەیاری پەروەردگار لەم بارەیەوە بەرچاوتان ڕوون دەکەینەوە..

## ((خاڵی دووهەم))

**ئەو فەرموودەیە تا چەند لەڕووی دەق و گێڕانەوە و گێڕەرەوەکانی پەسەندو دروستە؟**

پێشەکی دەقی فەرموودەکە بە "رواية"ە جۆراو جۆرەکانی دەخەینە بەر دیدی خوێنەران و پاشان هەڵی دەسەنگێنین.

١-عبدالقادری گەیلانی رەحمەتی خوای لەسەر بێت لە کتێبەکەیدا بەناوی (الغُنْية) بەرگی یەك لاپەرە ٨٣ دەفەرموێت {روى عن كثير بن عبدالله بن عمر وبن عوف عن ابيه عن جده (رضى الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ (لتسلكن سنن من قبلكم حذو النعل بالنعل، ولتأخذوا مثل اخذهم ان شراً فشراً وان ذراعاً فذراعاً وان باعاً فباعاً، حتى لو دخلوا حجر ضب لَدَخلتم فيه الا ان بنى اسرائيل افترقت على موسى باحدى وسبعين فرقة كلها خالة لدخلتم كلها ضالة، الافرقة واحدة الاسلام وجماعتهم، ثم انها افترقت على عيسى بن مريم باثنين وسبعين فرقة كلها ضاله الا واحدة الاسلام وجماعتهم، ثم انكم تكونون على ثلاث وسبعين فرقة لكهم ضاله الا واحدةً الاسلام وجماعتهم}.

واتە: کثیری کوڕی عبدالله ی کوری عمری کوڕی کوڕی عوف لە باوکیەوە ئەویش لەباپیریەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ئێوە دەکەونە سەر ڕەوشتو ڕێبازی ئەوانەی کە لەپێش ئێوەوە بوون پێ بەپێ. وە وەری دەگرن وەکو ئەوان وەریان گرتووە بست بەبستو گەز بەگەزو باڵ بەباڵ تاوەکو ئەگەر ئەوان بچنە کونی تێرتێرەوە ئێوەیش دەچنەناویەوە ئاگاداربن کە بەنی ئیسرائیل لەسەر

موسا پێغەمبەر بونە حەفتاویەك دەستە کە هەموویان گومڕابوون تەنها یەکێکیان نەبێت ئەویش ئیسلامو کۆمەڵی ئیسلامە. پاشان ئەوان لەسەر عیسی پێغەمبەری کوڕی مەریەم بونە حەفتاو دوو دەستە. کە هەموویان گومڕابوون جگە لە یەکێکیان نەبێت ئەویش ئیسلام و کۆمەڵی ئیسلامە...

٢-دیسانەوە عبدالقادری گەیلانی بەجۆرێکی تر ئەم فەرموودەیە دووبارە دەکاتەوەو دەڵێت: {عن عبدالرحمن بن جبیر بن نفیر عن ابیە عن عوف بن مالك الاشجعی قال: قال رسول الله ﷺ (تفترق امتی علی ثلاثة وسبعین، فرقة اعظمها فتنة علی امتی الذین یقسون الامور برأیهم یحرمون الحلال ویحللون الحرام)} هەمان سەرچاوە.

واتە: عبدالرحمن کوڕی جبیر کوڕی نەفیر لەباوکیەوە لەعەوفی کوڕی مالکی ئەشجەعیەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی ئوممەتی من دەبێتە حەفتاو سێی دەستەو تاقمەوە کە گەورەترینیان لە بەڵاو نەهامەتدا لەسەر ئوممەتم ئەوانەن کە فەرمانەکان بەراورد دەکەن بەگوێرەی بۆچونی خۆیان حەلاڵ حەرام دەکەن‌و حەرامیش حەلاڵ دەکەن.. ئەم دوو فەرمودەیە نە لەڕوی دەقەوە. وە نەلەڕوی بگیرە وە لەیەك ناچن وە زۆر لەیەکیشەوە دورن لەفەرمودەی یەکەمدا ئەوە بەدی دەکرێت کە جولەکەو گاور لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکانیان گومڕابوون وە بونەتە حەفتاو یەك وە یان دوو فرقەو دەستە کە پەروەردگاریش لەقورئانەکەیدا ئەم بۆچونە پشت ڕاست دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿وقالت الیهود لیست النصاری علی شیٔ وقالت النصاری لیست الیهود علی شی﴾ (البقرة).

واته: جولەکەکان دەیانوت گاورەکان لەسەر شتێك نین. وە گاورەکان بەجولەکەکانیان دەوت لەسەر هیچ شتێك نین. لێرەدا پرسیار ئەوەیە کە ئایا ئەو حەفتاو سێ فرقەیەی کە لەمێژوی ئیسلاما باسیان هاتوە وەکو ئەشعری، شیعە، سنی معتزلە، جبریە، قدریة... هتد.

هیچ کام لەوانە نکۆڵیان لەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمد ﷺ بووە؟ کە بێگومان نەخێر بەڵکو لەو ئایەتو فەرمودانەدا کێشەیان هەبووە کە چەند مانایەك هەڵدەگرن وەیان دەقێکی لەسەر نەبووە.

وە لەفەرمودەی دوهەمدا، ئەوە بەدی دەکرێت کە باسێك لەجولەکەو گاور نیە. بەڵکو هەرەشەیە لەو کەسانەی کە "قیاس" دەکەنە بەڵگە لەکاتێکدا کە بەلای زۆرێك لەزانایانی (اصولی فقە) قیاس یەکێکە لەو دە بەڵگەیەی کە شەریعەتی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە.

٣-ئەبو هورەیرە رەزای خودای لەسەر بێ لەپێغەمبەری خوداوە ﷺ گێراویەتەوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی {تفرقت اليهود على احدى وسبعين فرقةً وتفرقت النصارى على احدى واثنتين و سبعين فرقةً، وتفترق امتى على ثلاث وسبعين فرقةً}.

واتە: جولەکەکان بونە حەفتاویەك دەستە وە گاورەکان بونە حەفتاویەك یان دوو دەستە. وە ئوممەتی من دەبنە حەفتاو سێ فرقەو دەستەو تاقم. لەم فەرمودەیەدا ئەو زیادە نیە کە گوایە هەموو گومڕان جگە لەیەکێکیان نەبێت گومڕاو ڕزگار بوو بەیان نەکراوە تێیدا.

٤-لەمعاویەی کوڕی ابو سوفیانەوە گێڕراوەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: {ان اهل الکتاب افترقوا في دینهم علی اثنین وسبعین ملة، وان هذه الامة ستفترق علی ثلاث وسبعین ملة، کلها في النار الا واحدة وهي الجماعة}.

واتە: ئەهلی کتاب جیاوازی کەوتە نێوانیان لەسەر دینەکەیان وە بونە حەفتاو دوو ئاین، وە ئەم ئوممەتی منە دەبنە حەفتاو سێ ئاین کە هەموویان لەئاگران جگە لە یەکێکیان نەبێت کە ئەویش کۆمەڵە. لەم فەرمودەیەدا زیادە کە بەیان کراوە بەڵام بەجیاواز لەزیادەکانی تر لێرەدا جیاوازیان لەسەر خودی دینە. نەك لەتێگەیشتن لەچەمکی دین وە وشەی (ملة) لەزمانەوانیدا بەمانای ئاین هاتووە. وەکو دەڵێن (ملة، دین، شریعة) ئاین.

## ((خاڵی سێهەم))

## هەڵسەنگاندنی دەقی فەرموودەو گێڕەرەوەکانی

بەرلەوەی بچینە خزمەتی زانایانی فەرموودە پێویستە ئەوە بزانین کە ئەم فەرموودەیە بەهیچ دەقێکیانەوە لەلایەن مسلم و بخاریەوە دەرنەچووە و نەگەڕێنراونەتەوە. کە ئەمەیش گومانی زیاتر لەسەر دروست دەکات. جگە لە بەشێکی کەمی نەبێت کە لەیەکەم فەرموودەدا هاتووە. پاشان لەڕووی دەقەوە بزانین زانایان چی لەسەر دەڵێن:

١-زانای فقیە و مفسر احمدی کوڕی حزم ی ئەندەلوسی لە کتێبەکەیدا بەناوی (الفصل ٣/٢٩٣) دەڵێت: (لایصح اصلاً من طریق الاسناد لانها موضوعه غیر موقوفة ولامرفوعه).

واتە: لەڕێگەی سەنەدی فەرموودەکەوە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە چونکە دەست هەڵبەستە نە(موقوفه وە مرفوع) کە دوو جۆرە فەرموودەن لەڕووی سەنەدەوە.

٢-ابن الوزیر الیمانی زانای پایە بەرز لە کتێبەکەیدا بەناوی (العواصم القواصم) ج١/١٨٦ دا دەڵێت: (وایاك والاغترار بـ(كلها هالك الا واحدة)، فانها زیادة فاسدة، غیر صحیحة القاعدة، لایؤمن ان تكون من دسیس الملاحدة).

واتە: خۆت بپارێزە لەبای بوون لەڕستەی هەمو تیاچوون جگە لە یەکێکیان نەبێت چونکە ئەو ڕستەیە زیادەیەکی گەندەڵەو بنەمایەکی دروستی نیە وە نابێ ئەمین بین لەوەی کە ئەم زیادەیە پیلانی بێ دینەکان نەبێت.

٣-محمد علی شوکانی لەتەفسیرەکەیدا بەناوی (فتح القدیر ٣/٥٩)دا دەڵێت: (اما زیادة كونها في النار الا واحدة فقد ضعفها جماعة من المحدثین، بل قال ابن حزم: انها موضوعة).

واتە: بەڵام ئەو زیادەیەی کە لە فەرمودەکە هاتووە کە هەموو لەئاگران جگە لەیەکێکیان نەبێت. ئەوە ڕاستی کۆمەڵێ لەفەرمووده ناسان بەلاوازیان داناوە تەنانەت ابن حزم بەهەڵبەستراوی زانیوە، کەواتە لەڕووی ئەقڵ و سەنەدەوە زیادەکەی دەست هەڵبەستەو بەفەرمودەی پێغەمبەر ناژمێردرێت.

بەڵام لەڕووی گەڕێنەرانەوە ڕاوییەکان زۆرێك لەزانایان وەکو ترمذی، الحاکم ابن تیمیە، الذهبي، الشاطبی، ابن حبان، ئەویش لەبەرئەوەی کە زیادەی کەی تێدانیە. (کە هەموو لەئاگردان) (وصحح حديث ابي هريرة خاصة وليس فيها الوعيدُ ولا التفسير للناجية).

واتە: گەڕاندنەوەکەی ابو هریرەیان بەڕاست زانیوە بەتایبەتی چونکە هەڕەشەو ڕاڤەی ڕزگاربووانی تێدانییە.

وە باقی گەڕینەرەوەکان (الرواة) وەکو معاویەی کوڕی ابو سوفیان وە عبدالله ی کوڕی عمرو (عوف)ی کوڕی مالك. چونکە کەسی وەهای تێدایە کە (ناصبی)یە واتە لەوانەیە کە جنێو قسەی ناڕەوا بەامامی علی (کرم الله وجهه) دەڵێت متمانە بەگەڕێنراوەکانیان ناکرێت وەکو ابن الوزیر لەکتێبەکەیدا (العواصم والقواصم)دا دەڵێت: (وفي سند حديث معاوية ناصبی فلم يصح عنه، وفي حديث عبدالله بن عمر وعوف بن مالك. ليس فيها شيئٌ على شرط الصحيح ولذلك لم يخرج الشيخان شيئاً منها). العواصم والقواصم، ج٣/١٧٠.

واتە: لەسەنەدی ئەو فەرموودەیە کە معاویە گێڕاویەتەوە کەسێکی (ناصبی) تێدایە کە دروست نیە گەڕێنراوەی لێ وەربگیرێت.

وە لەوفەرموودەیەدا کە عبدالله ی کوڕی عمر و عوفی کوڕی مالك گێڕاویانەتەوە هیچ مەرجێکی ڕاستی و دروستی تێدانیە هەر لەبەرئەوەیە کە شیخان واتە بخاری و مسلم نەیان گێڕاوەتەوە.

## ((خاڵی چوارهەم))

**ئەگەر ئەو حەفتاو سێ فرقە ئومەتی پێغەمبەرن چۆن دەچنە ئاگرەوە، گریمان ئەم فەرمودەیە لەهەردوو ڕووی دەق و گێڕانەوەوە ڕاست و دروست بێت بەزیادەکەیشیەوە کە زیاتر جێگەی مشتومڕە. ئایا ئەوە دەگەیەنێت کە بەچونە ناو ئاگرەوە لەئیسلام دەرچووبن وە بەبێ باوەڕ بژمێردرێن؟ وە مانای ئوممە چیەو چەند جۆر دەگەیەنێت؟**

بۆ وەڵامی ئەم دوو پرسیارە دەچینە خزمەتی زانایان و شارەزایانی فەرموودە تا لەوانەوە ڕێنمایی بکرێن و بەهەڵە مۆرکی بێ باوەڕی لەنێوچەوانی کەس نەدەین.

وەڵامی پرسیاری یەکەم:

**١) پێشەوای زمانەوانی و زانای شەرع (ابو سلیمان الخطابی لەتەفسیری ئەو فەرموودەی حەفتاو سێ فرقەدا دەڵێت: (فیه دلالة علی ان هذه الفرق کلهًا غیر خارجةٍ من الدین، اذ قد جعلهم ﷺ کلهم من امته) انظر معالم السنن ج٤/٧).**

**واتە: لەو فەرموودەیەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە ئەم "فرق" دەستانە لەئاینی ئیسلام دەرنەچوون. چونکە پێغەمبەری ئیسلام هەموویانی بەئوممەتی خۆی داناوە. بڕوانە کتێبی (معالم السُنَنْ).**

**٢)شیخ الاسلام ابن تیمیه لە کتێبەکەیدا بەناوی منهاج السنه ج٣٤١/٥ دا دەڵێت: (والنبی ﷺ لم یخرجهم من الاسلام، بل جعلهم من امته).**

**واتە: پێغەمبەری خودا ئەو فرقانەی لەئیسلام دەرنەکردووە بەڵکو بەئوممەتی خۆی داینآون و ناوی بردوون....**

٣)پێشەوای وردبین و لێکۆڵەر (ابو اسحاق الشاطبی) لەکتێبەکەیدا بەناوی (الموفقات) ج٤/١٩٣-١٩٤ دا لەسەر ئەم فەرموودەیە بەم جۆرە دەڵێت: (ليس في النصوص الشرعية مايدل دلالةً قطعية على خروجهم عن الاسلام، والأصل بقاؤه حتى يدل على خلافه، واذا قلنا بتكفيرهم فليسوا اذاً من تلك الفرق بل الفرق من لم تؤدهم بدعتهم الى الكفر وانما بقت عليهم من اوصاف الاسلام مادخلوا به في اهله، والامر بالقتل في حديث الخوارج لايدل على الكفر، اذ للقتل اسبابٌ غير الكفر، كقتل المحارب والفئة الباغية بغير تاويل واشبه ذلك، فالحق ان لايحكم بكفر من هذا سبيله)...

واتە: لەدەقە شەرعیەکاندا هیچ بەڵگەیەکی چەسپاو نیە لەسەر دەرچوونی ئەو دەستانە لەچوار دیواری ئیسلام. وە ئەساس مانەوەیانە لەناوئیسلام دا. هەتا بەڵگەیەك جودا لەو دەقە پەیدا دەبێت لەسەریان. وە ئەگەر وتمان ئەوانە "کافر" و بێ باوەڕن کەواتە لەڕیزی ئەو دەستانە نین کە مێژوونوسان ئەو فەمووودەیانە بەسەردا سەپاندون. بەڵکو "فرق" دەستە بەکەسانێك دەوترێت کە "بدعە" داهێنراوەکەیان لەدینا نەگاتە ئاستی بێ باوەڕی. بەڵکو دەبێ سیفاتی ئیسلامەتیان لەسەر مابێت کە لەناو ئیسلام بیان هێڵێتەوە. وە لەفەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ فەرمان بەکوشتنی (خوارج) دەرچوان یان لادەران هاتووە کە یەکێکن لەو حەفتاو سێ دەستەیە. بەڵگە نیە لەسەر بێ باوەڕیان. چونکە کوشتن هۆکاری زۆری هەیە جگە لەبێ باوەڕی. وەکو کوشتنی کەسێك کە جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان دەکات، وەیان دەستەیەکی یاخی لەدەوڵەتی ئیسلامی بەبێ هۆیەکی شەرعی دەیان وێنەی ئەمانە. کەواتە ڕاستیەکەی ئەوەیە کە داوەری ئەوە کە فەرمان بەکوفری کەسێکدا نادرێت. کە لەو دەستانە بێت.

## وەڵامی پرسیاری دووهەم

## مانای "ئوممة" چیە ؟

ئەگەر بەوردی لەهەموو دەقە جۆراوجۆرەکانی فەرمودەی حەفتاو سیٚ فرقەکە بدەین وشەی "امتی" دوبارە کراوەتەوە و بەس کە بەپیتی (یێی) (نبسە) کۆتایی پیٚ هاتووە واتە: ئوممەتی من کە ئەمەیش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە تەواوی ئەو حەفتاو دوو دەستەیە لەژێر ناوی ئیسلام دا ماونەتەوە کە ئەگەر بیٚ باوەڕو دەرچوو لەئیسلام بونایە هیچ کات پێغەمبەر ﷺ بەئوممەتی خۆی دانەدەنان. وە مەبەست لە ئوممەت ئوممەتی ئیسلامە.

"امة" لە زمانەوانیدا بەچەند مانایەك هاتووە کە ئەمانەن:

أ-بەمانای "جماعة" کۆمەڵ: کە مختار الصحاح لاپەڕە (٢٥)دا هاتووە: (الأمة) (الجماعة قال الاخفش هو في اللفظ واحد وفي المعنى جمع) واتە: ئوممە وشەکەی تاکەو ماناکەی کۆیە.

ب-بەمانای ڕێگەو دین هاتووە: فلان لا امة له اي لادين له ولا نحله. واتە: فلان کەس ئوممەتی نیە. یانی دینی نیە وە گەلی نیە.

ج-بەمانای کات هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿واذكر بعد امة﴾ واتە: کەوتەوە بیری پاش کاتو زەمانێك...

ماوەتەوە پرسیارێك، ئایا ئەو حەفتاو دوو فرقە لەکام ئوممەتن یەکەم (امة الاجابە) بەدەمەوە هاتوو. دوهەم (امة دعوة) بانگ کراو کە بێگومان مەبەستی پێغەمبەر کە دەفەرموێت ئوممەتی من ئەوانەن کە بەدەنگی بانگەوازەکەیەوە هاتوون وە باوەڕیان پیٚ هێناوە. نەك ئەوانەی کە

بانگی کردون وەلأمیان نەداوەتەوە بەباوەڕ پێ کردنی چونکە (امة دعوة) بەبێ وەلأمدانەوە لەئاگردان. وە بەئوممەتی پێغەمبەر دانانرێن وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {والذي نفس محمد بيده، لايسمع بي احد من هذه الامة يهودىٌ ولانصراني ثم يموت ولم يؤمن بالذي ارسلت به الا كان من اصحاب النار} اخرجه مسلم عن ابی هريره: رقم ١٥٣.

واتە: سوێند بەو کەسەی کە گیانی محمدی بەدەستە هەر ئوممەتێ لەجولەکەو گاوڕ گوێی لەبانگەوازی من دەبێت و باوەڕ بەو پەیامە نەهێنێت کە بۆمن ڕەوانەکراوە. وە پاشان بمرێت ئەوە لەهاوەلأنی ئاگرە یانی بەبێ باوەڕی دەمرێت.

کەواتە ئەو حەفتاو دوو فرقەیە لەئوممەتی پێغەمبەرن وە ئوممەتی (اجابە)ن وە ئەگەر فەرزەن بچنە ناو ئاگریشەوە تێیدا نامێننەوە چونکە موسلمانی گوناهبارن نەك بێ باوەڕ...

## ((خاڵی پێنجەم))

## تا چەند ئەم فەرموودەیە لەگەڵ قورئاندا هاوسەنگەو پێك دێت

لەپێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە فەرموودەکە نە لەڕووی دەقەوە، وە نە لەڕووی (راوی) گێڕەرەکانیەوە یەك نین وە ئەو زیادەیەی کە دەستنیشانی بەهەشتی‌و جەهەنمی دەکات بەڕای تەواوی زانایانی فەرموودەوە دەست هەڵبەست‌و لاوازو دروستکراوە. جگە لەوەش لەگەڵ ئەو ڕێزو گەورەیی‌و، پلە بەرزییەی کە خوای گەورە بۆ موسوڵمانانی قەرارداوە و بەرزی کردونەتەوە بەسەر جولەکەو گاورو باقی گەلانی عالەمدا، نەگونجاوەو یەك ناگرێتەوە.

وە ئێمە لێرەدا بەراوردی دەکەین بەیەك ئایەتی قورئانی پیرۆز تا زیاتر نەبونی ئەم هاوسەنگیەمان بۆ ڕون بێتەوە..

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (البقرە: ٢١٣).

واتە: کاتی خۆی خەڵکی لەپێش حەزرەتی نوحدا یەك بوون لەسەر بێ باوەڕی پاشان خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردن بەمژدەدەرو ترسێنەرەوە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا پەیامی بۆ ناردنە خوارەوە تاوەکو

داوەری بکەن بەڕاستی لەنێوان خەڵکیدا لەو شتانەی کە ناکۆکیان هەیە لەسەری، بەڵام ناکۆكو ڕاجیانە بوو لەسەری جگە لەوانە نەبێت کە پەیامی خودایان بۆ هاتوو هەموو شتێکی بۆ ڕوون کردنەوە بەڵام جیاوازی کەوتە ناویانەوە بەهۆی یاخی بونیانەوە وە خوای گەورە ڕێنمایی ئەوانەی کرد کە باوەڕداربوون بۆ سەر ڕێگای ڕاست و نەیهێشت ناکۆکی بکەوێتە نێوانیانەوە ئەمەش بەفەرمانی خۆی. وە خوای گەورە ڕێنمایی هەر کەسێك دەکات بەخواستی خۆی بۆسەر ڕێگای راستو دروست کە ئەویش ئیسلامە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بەدوو شت دەکات کە جێگەی سەرنجە:

**یەکەم/** دووبەرەکی ناکۆکی لەنێوان پەیڕەوانی ئاینە پێشوەکان بەتایبەت جولەکەو گاور ئەویش بەهۆی سەرکەشی و یاخی بونیانەوە.

**دووهەم/** پەروەردگار بەخواستی خۆی موسڵمانان لەو دوروبەرەکیو ناکۆکیە دەپارێزێ و، بۆ سەر ڕێگای راست ڕێنماییان دەکات کە نایەڵێ بەو دەردە دوچار ببن.

زانای پایە بەرز مفسری قورئان (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدالەسەر ئەم ئایەتە فەرموودەیەکی درێژ دەهێنێت کە زۆربەی هەرە زۆری ناکۆکیەکانی نێوان جولەکەو گاور بەیان دەکات و ڕزگاربونی موسڵمانان لەو ناکۆکیەدا بەڕێنمایی پەروەردگار ڕوونو ئاشکرا دەکاتو دەڵێت:

{ فهدى الله الذين آمنوا لما اختلفوا فيه من الحق باذنه، فاختلفوا في يوم الجمعة فاتخذ اليهود يوم السبت، والنصارى يوم الاحد، فهدى الله امة محمد ﷺ ليوم الجمعة. واختلفوا في القبلة، فاستقبلت النصارى المشرق، واليهود بيت المقدس، فهدى الله امة محمد ﷺ للقبلة،

واختلفوا في الصلاة فمنهم من يركع ولا يسجد، ومنهم من يسجد ولايركع، ومنهم من يصلي وهو يتكلم ومنهم من يصلي وهو يمشي، فهد الله امة محمد للحق من ذلك، واختلفوا في ابراهيم عليه السلام فقالت اليهود: كان يهوديا، وقالت النصارى: كان نصرانيا، وجعله الله حنيفا مسلما فهدى الله امة محمد للحق من ذلك، واختلفوا في عيسى عليه السلام، فكذبت به اليهود وقالوا لأمه بهتانا عظيماً، وجعلته النصارى الها وولداً وجعله الله روحه وكلمة، فهدى الله امة محمد ﷺ للحق من ذلك، وكان ابو العاليه يقول: في هذه الآية المخرج من الشبهات والضلالات والفتن. انظر تفسير مختصر ابن اكثير ج١، ص١٨٨}.

واته: عبدالرحمن كوڕی زيدی كوڕی اسلم لەباوكيەوە لەبارەی ئەم ئايەتەوە (فهد الله الذين آمنوا لما اختلفوا فيه من الحق باذنه) دەڵێت: اهلى كتاب جياوازی كەوتە نێوانيانەوە لەسەر ڕۆژی پشوو "جمعه" جولەكەكان شەممەيان كردە پشوو، وە گاورەكان ڕۆژی يەك شەممەيان كردە پشوو، خوای گەورە ڕێنمايی ئوممەتی محمدی كرد بۆ ڕۆژی جمعە. پاشان ناكۆك بون لەسەر "قبلە" ڕۆگە، گاورەكان ڕويان كردە ڕۆژهەڵات وە جولەكەكان ڕويان كردە (قدس) خوا ڕێنمايی ئوممەتی محمدی كرد بۆ "قبلە"ی ئێستە كە كەعبەيە، پاشان جياوازيان لەسەر نوێژكردن كە هەندێكيان كڕنوشيان دەبرد بەبێ سوجدە وە هەندێكيان سوجدەيان دەبرد بەبێ كڕنوش وە هەندێكيان نوێژی دەكرد و قسەيشی دەكرد وە هەندێك نوێژی دەكردو بەڕێوە دەڕۆيشت. خوای گەورە ڕێنمايی ئوممەتی محمدی كرد ﷺ بۆ ڕاست و ڕەواكەيان كە نوێژی ئێستای موسوڵمانانە پاشان ناكۆك بون لەسەر ڕۆژوگرتن. كە هەندێكيان نيوەی ڕۆژ بەڕۆژ دەبوون. وە هەندێكيان تەنها هەندێ

خواردنیان لەخۆیان قەدەغە دەکرد بەڵام خوای گەورە ڕێنمایی موسوڵمانانی بۆ ئەو ڕاستییەی کە ڕۆژی ئێستایە کرد.
پاشان جیاوازی کەوتە نێوانیان لەسەر حەزرەتی ابراهیم سەلامی خودای لەسەر بێت کە جولەکەکان دەیان وت ابراهیم یەهودیە. وە گاورەکان دەیان ووت ابراهیم گاورە بەڵام خودای گەورە گێڕای بە موسوڵمانێکی خاوێن. وە خوای گەورە ڕێنمایی ئوممەتی محمدی کرد بۆ ئەو ڕاستیە، پاشان جیاوازیان بوو لەسەر عیسای کوڕی مریەم سەلامی خوای لەسەر بێت. کە جولەکەکان عیسایان بەدرۆ خستەوە تاوانی گەورەیان دایە پاڵ دایکی. وە گاورەکانیش دەیانووت بەعیسا، کە خودایە و کوڕی خودایە بەڵام خودای گەورە بەرۆح و وشەی خۆی لەقەڵەمیدا، وە خوای پەروەردگار ڕێنمایی ئوممەتی محمدی ﷺ کرد بۆسەر ئەو ڕاستو ڕەوایەی کە خۆی دایناب‌وو.
ابن کثیر دەڵێت: "ابو العالیة" وتویەتی لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەرچوون و ڕزگاربونی تێدایە بۆ موسڵمانان، لەلێك چوان و، گومڕایی و، ئاشوب....
کە ئەم فەرمودەیە زۆر بەڕاشکاوی دەستەبەندی جولەکەو گاور بەیان دەکاو هۆکاری ئەو فرقە گەراییەیش ڕون دەکاتەوە و موسڵمانانی ئوممەتی محمدی ﷺ لێ دەرباز دەکات، ئایا دەکرێت ئوممەتی محمد لەوان زیاتر تەفرەقەیان تێ بکەوێت کە هیچ کات ئوممەتی محمد لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد و باقی پێغەمبەرانی تر بچوکترین ناکۆکیان نەبووە ئەدی بۆچی وە لەسەرچی ببنە حەفتاوسێ فرقە، خوێنەری بەرێز خۆت بڕیار بدە...

## ((خاڵی شەشەم))

## ئەو حەفتاو سێ فرقەیە تێپەڕیوون، ئێستا هەن، یان نەهاتوون

کاتێ بەوردی لەفەرموودەکە دەکۆڵینەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەگەر فەرموودەکە بگاتە پلەی ڕاستو دروستی لەهەردوو ڕووەوە، ئەوە تەنها ئەو بەشەی دروستە کە تەنها باسی حەفتاو سێ "فرقە"کە دەکاتو بەس وە باقی ئەوەی کە باس لەوە دەکات حەفتاو دوویان لەدۆزەخ دایە و یەکێکیان لەبەهەشتایە، بەلای تەواوی زانایانی فەرموودە نەدروستەو نە ئەساسێکی هەیە وە بەدەست هەڵبەستی دەزانن، چونکە نە پێغەمبەری ئیسلام بەچونە ئاگرو بەهەشتەوە لەیەکی جودا کردوونەتەوە.

وە نەهاوەڵانو زانایانی "سلف" لەسەدەی یەکەمو دوهەم، ناوزەدی ئەو حەفتاو سێ دەستەیەیان کردوە بەڵام بەچوار سەدە لەپاش زانایانی "سلف" پێشینە مێژوونوسان ئەو حەفتاو سێ "فرقە" دەستەو تاقمەیان ناوزەد کردوە..

١-خاوەن کتێبی (اضواء على حديث افتراق الامة) تاليف عبدالله بن يوسف الجديع، لاپەڕە (٥١)دا دەڵێت (وانما اشتهر بتعين الفرق المقصود بهذا الحديث جماعة من المتأخرين، كأولئك الذين صنفوا في تأريخهم، من امثال الشيخ عبدالقاهر بن طاهر البغدادى صاحب (الفرق بين الفرق) بل اجتهد هذا ليصيرهم ثلاثا و سبعين فرقة وقدمات سنة (٤٢٩هـ) فكان الافتراق عن الصراط المستقيم قد انتهى الى زمانه، ومن عجب ان الشيخ عبدالقاهر كان من الاشعرية الذين قالت فيهم طوائف من المتكلفين من بعدهم: (الاشعرية من الفرق الأثنين والسبعين التي في

النار)، فلا حول ولاقوة الا بالله، ولعلك تدرك من هذا كم كان منهاج السلف الاولين على الخير والسلامة).

واتە: ئەوەی کە ناسراوە بەدیاری کردنی ئەو دەستانەی کە مەبەستن بەو فەرمودەیەوە کۆمەڵێکن لەشوێنکەوتوانی پێشینە وەکو ئەوانەی کە لەکتێبی مێژووەکانیان ناوزەدیان کردون. وەکو شێخ عبدالقاهر بەغدادی خاوەن کتێبی (جیاوازی لەنێوان دەستەکاندا) بەڵکو هەوڵی زۆری داوە تاوەکو ئەو حەفتاو سێ "فرقە"یان لێ تەواو بکات. کە شێخ عبدالقاهر لە ساڵی ٤٢٩ ھ کۆچی وەفاتی کردوە کە بەگوێرەی ناوزەدکردنی ئەو دەستانە کە لە ڕێگەی ڕاست ترازاون هەتا زەمانی شێخ کۆتایی پێ هاتووە، وە ئەوەی کە جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە خودی شێخ عبدالقاهر لەدەستەی ئەشعەریەوەکانە. کە لەپاش مردنی شێخ تاقمێك لەبارگرانان تاقمی ئەشعریە یان لەریزی ئەو حەفتاو دوو "فرقە"یە داناوە کە لە ئاگردان کە دەبێ بەداخ و ئەسەفێکی زۆرەوە بڵێین: هیچ پەناو هێزێك نیە جگە لە (الله) نەبێت وە ڕەجا وەهایە لەمەوە بۆت ڕون بێتەوە کەڕێبازی (سلف صالح) چەندە لەسەر چاکەو پارێزراو بوون.

٢-زانای پایەبەرز شێخ الاسلام ابن تیمیە (رحمە الله) لەم بارەیەوە دەفەرموێت: {واما تعيين هذه الفرق فقد صنف الناس فيهم مصنفات وذكروهم في كتب المقالات، لكن الجزم بأن هذه الفرقة الموصوفة احدى الثنتين والسبعين لابد له من دليل، فان الله حرم القول بلا علم عموماً، وحرم القول عليه بلا علم خصوصاً، حتى قال: (وايضاً فكثير من الناس يخبر عن هذه الفرق بحكم الظن والهوى، فيجعل طائفته والمنتبسة الى متبوعه الموالية له هم اهل السنة والجماعة، ويجعل من خالفها اهل

البدع، وهذا ضلال مبين، فأن اهل السنة والحق لايكون متبوعهم الا رسول الله ﷺ) فمن جعل شخصاً من الاشخاص غير رسول الله ﷺ من احبه ووافقه كان من اهل السنة والجماعة ومن خالفه كان من اهل البدع والفرقه، كان من اهل البدع والضلال والتفرق} مجموع الفتاوى ٣/٣٤٦-٣٤٧.

واتە: بەلأم دیاری کردنی ئەو فرقانە کە خەڵکی دابەشی کردون لەناو دانراوەکانیاندا وە ناویان بردون لەپەڕاو بێژراوەکانیاندا دەبێ ئەوە بزانرێت کە جەخت لەسەر ئەو دەستەو تاقمانە بەو تاریفەی کە یەکێك لەو حەفتاودوو فرقەن پێویست بە بەڵگە دەکات، چونکە خوای گەورە یاساغی کردووە وەتەی بێ زانین بەگشتی. وە یاساغی کردوە بەناوی خوداوە قسەکردن بەبێ زانیاری بەتایبەت کە تەنانەت ابن تیمیە دەڵێت: دوبارە زۆرێك لەخەڵکی هەواڵی ئەوە دەدەن کە ئەو دەستەو فرقانە کێن و کامانەن لەسەر بنەمای گومان و ئارەزووبازی بەجۆرێك کە ئەوەی دەستەو تاقمی خۆیەتی وە پەیوەندی بەوەوە هەیەو شوێن کەوتەو هەوادارییەتی ئەوە بەئەهلی "سنەو جماعە"تی بزانێت، وە ئەو دەستەو کەسانەی کە ڕای جیاوازی لەگەڵ ئەم و دەستەکەی ئەمدا هەبێت بەئەهلی "بدعە" بزانێت، ئەوە دەستەو تاقم و کەسانێکی ئاوەها لەگومڕاییەکی ئاشکرادایە چونکە ئەهلی حەق و "سنە"ت بەکەسانێك دەوترێت کە شوێنکەوتەی پێغەمبەری خودا ﷺ بێت کەواتە ئەگەر کەسێکی تری جگە لە پێغەمبەری خودا خۆش بوێت وە هاوڕابێت لەگەڵیدا و تەنها ئەوە بە ئەهلی "سنەو جماعە" بزانێت وە کەسێکیش لەگەڵ ئەواندا نەبێت بەئەهلی بدعەو "فرق" بزانێت وەکو زۆر لەو دەستەو تاقمانە هەن و وەها بیردەکەنەوە، ئەوە لە ڕاستیدا خۆیان ئەهلی

بدعه " گومڕایی و فرق"ن... بڕوانه مجموع الفتاوی ابن تیمیه بەرگی ٣ لاپەڕە ٣٤٦-٣٤٧.

دوباره ابن تیمیه (دەربارەی دیاری کردنی ئەهلی ئاگردا لەکتێبێکی تریدا بەناوی (منهاج السنه ج٥/ص ٣٤٩-٣٥٠) دەڵێت (فلا نشهد لمعین بالنار لإمكان انه تاب، او كانت له حسنات محت سيئاته، اوكفّر الله عنه بمصائب او غير ذلك).

واته: ئێمه شایەتی نادەین لەسەر کەسێکی دیاریکراو بەئەهلی ئاگر چونکه ئەگونجێ که پاشان تۆبەی کردبێت، وه یان چاکەکانی خراپەکانی شۆردەبێتەوه، یان خوای گەوره لەتاوانەکانی بورابێت بەهۆی بەلاو نەهامەتیەکەوه که توشی بوبێت وەیان جگه لەمانەش.

لەم فەرمودانەوه که زانایان لەسەر فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ بەیانیان کردووه بۆ مان دەردەکەوێت که: نەخوای گەوره و نەپێغەمبەرەکەی و، نەهاوەڵانی، نه (سلفی صالح) ئەو فرقانەیان دەستنیشان نەکردووه، زۆربەی مێژوونوسان له یوسفی کوڕی (اسباطه) وه گێڕاویانەتەوه که وتویەتی ڕیشەی "بدعه" و داهێنان لەدنیا چوار دەستەن (الرافضه، الخوارج، القدريه، المرجئه) وه هەریەکەی لەمانه ١٨ فرقەیان لێ جودا بوەتەوه بونەته ٧٢ "فرقه".

٣- بەگوێرەی مێژوونسان بێت ئەوانه ڕۆیون ئیتر دەستەو تاقمی تازەی بەرناکەوێت، کەجگه لەدوانیان که شیعەو سنەی ئەشعرین ئەوانی تر نەماون وەکو دەستەو تاقم.

٤-بەبێ بەڵگەو زانیاری ناتوانین هیچ دەستەیەك لەم ڕۆژەدا بەیەکێك لەو حەفتاو دوو "فرقه"یه دەستنیشان بکەین..

## (( خاڵی حەوتەم ))

## ئایا حزبە ئیسلامیەکان بە "فرق" دادەنرێن وەتاچەند فرە حزبی لەئیسلامدا ڕەوایە

لەپاش نەمانی دەوڵەتی ئیسلامی گشتگیر کە خەلافەتی عثمانی یان پێ دەوت وە زۆرێك لەولأتانی ئیسلامی لەژێر سایەیدا پارێزراو لە ئەمانابون. کە بەنەمانی خەلافەتی عثمانی یەك پارچەی موسوڵمانان نەما. وە جولەکەو گاور کە دوو دوژمنی بەبێ بەزەیی موسڵمانان بون ولأتانی ئیسلامیان داگیرکرد و وەبەکوشتنی دڵسۆزانی ئیسلام و تالأنکردنی سەرچاوەی ژیانیان ڕازی نەبون. بەڵکو دەستورو یاسای گەلانی موسڵمانیان لەقورئان‌و شەریعەتی ئیسلامیەوە گۆڕین بۆ دەستورو یاسای (علمانیە) سکۆلاریزم، کە دەستچن‌و دروستکراوی خۆیان بووە وە دینیان لەدەوڵەت جوداکردەوە و حەرامی خوای گەورەیان حەلأڵ‌و حەلاڵی خوای گەورەیان حەرام کرد.

کە لەپاش حەفتا ساڵ لەزۆربەی ولأتانی ئیسلامیدا و بەتایبەت لەعێراقی ئێمە هەتا ئەمڕۆ بەردەوامە. وە لەماوەی ئەم حەفتاو چەند ساڵەدا لەگۆشەو کەناری ولأتانی ئیسلامیدا، لاوانی بانگخوازو زانایانی دڵ ڕۆشن بێداربونەوە و بەهەوڵ‌و کۆششی خۆیان وە بەگیان خستنە سەردەستیان بۆ گەڕانەوەی فەرمانڕەوایەتی ئیسلام چون بەگژی جولەکەو گاورو نۆکەرانیانا هاتنە مەیدان‌و، بەدروست کردنی حزب‌و ڕێکخراوی جۆراوجۆرو شێوازی پەروەردەو بانگەواز زۆرێك لەڕۆڵەی گەلانی موسوڵمانیان لەبێ ئاگایی و خەوی مەرگبار بەئاگاه هێنانەوە و

خۆیشیان لەزیندانەکانی نۆکەرانیان وەیان لەمەیداندا بەپیلانی جۆراوجۆر لەسێدارە دران‌و، گوللەباران کران، کە جمال الدین ئەفغانی و حسن البناء ، سید قطب، و کتور علی شریعەتی، نوابی سەفەویی و، عبدالقادر عودەو، عبدالعزیز بدری و دەیان‌و هەزاران لەم کەڵە پیاوانە نمونەی ڕونی قڕکردنی ئەو پیاوە بەرزانە بوون.

کە دروست کردنی حزب وەکو ئامێرو وەسیلەیەك بۆ چەسپاندنی شەریعەتی پەروەردگار و فەرمانڕوایەتی ئیسلام دەوری هەرە کاریگەری هەبوو لەڕابوونی ئیسلامیدا وە قەڵغانێك بوو لەبەردەمی تیری دوژمنانی ئیسلامدا. بەجۆرێك کە نۆکەرانی جولەکەو گاور لەنێو وڵاتانی ئیسلامیدا بەچۆکا هاتوون لەبەردەمی ڕۆڵە بەئەمەکەکانی ئیسلامدا کە ئەمڕۆ ئاغا خۆی هاتووەتە مەیدان بۆ پارێزگاری لەنۆکەرانیان‌و، سەرکوتکردنی موسڵمانان‌و نەهێشتنی ئیسلام. کە بەیاری پەروەردگار ئاغایش بەچۆکا دێت و جارێکی تر خۆری ئیسلام لەئاسۆی ژیانمان وە لەدەم کەلی وڵاتانی ئیسلامیدا هەڵدێت...

بەڵام بەداخەوە بەهۆی پیلانی شەوو ڕۆژی دوژمنانی ئیسلام، وە نەزانی و کرچ‌و کاڵی، و هەڵپەی گەیشتن بەناو شورەت‌و پلە هەر وڵاتێك لەباتی یەك حزب، چەندین حزبی ئیسلامی تێدایە کە بووەتە جێگەی سەرنج‌و پرسیار. وە ئەم پرسیارەیش دەوروژێنێت کە ئایا ئەحزابی ئیسلامی بە "فرق" دەستەو تاقم دادەنرێت؟

ئێمەیش بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەچینە خزمەتی زانای پایە بەرز شێخ الاسلام ابن تیمیە (رحمە الله).

کە دەڵێت: (واما راس الحزب فانە راس الطائفة التي تتحذب، ای تصیر حزبا، فان کانوا مجتمعین علی ما امر الله بە ورسولە من غیر زیادة

ولانقصان فهم مؤمنون لهم مالهم وعليهم ماعليهم، وان كانوا قد زادوا في ذلك ونقصوا مثل التعصب لمن دخل في حزبهم بالحق والباطل والاعراض عمن لم يدخل في حزبهم سواء كان على الحق والباطل، فهذا من التفرق الذي ذمه الله تعالى ورسوله فان الله ورسوله امرا بالجماعة والائتلاف ونهيا عن التفرق والاختلاف، وامرا بالتعاون على البر والتقوى ونهيا عن التعاون على الاثم والعدوان) مجموع فتاوى ابن تيميه: ٩٢/١١.

واتە: سەرکردەی حزب بریتیە لەسەرکردەی تاقمێك کە بوبێت بەحزب جا ئەگەر کۆبون لەسەر ئەو دەستورو یاسایانەی کە خوداو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێ داون بەبێ کەمو زیاد، ئەوە ئیماندارن، چ مافێك بۆ ئیماندار هەیە بۆ ئەو حزبیانەیش هەیە، وە چ ئەرکێك لەسەر ئیمانداران هەیە لەسەر ئەوانیش هەیە، بەلأم ئەگەر لەسەر دەستوری ئیسلام زیادو کەمیان کرد، بۆ نمونە دەماگیریی‌و پشتیوانی کردن لەکەسێك کە دەچێتە ناو حزبەکەیانەوە بەچاك یان خراپ بەرگری لێ بکەن چونکە لایەنگری حزبەکەیانە.

وە پشت هەڵکردن‌و ڕوو وەرگێڕان لەو کەسانەی کە لەناو حزبەکەیدا نین جا ئەو پشت هەڵکردنە ڕەوا بێت یان ناڕەوا وە ئەو کەسانەی کە لەدەرەوەی حزبەکەدان ڕاستن یان ناڕاست ئەمانە هەر پشتی تێ هەڵکەن ئەمە پێی دەوترێت ئەو "فرق"و دەستانەی کە خودا و پێغەمبەرەکەی نکۆڵی لێ دەکەن. چونکە خودا و پێغەمبەرەکەی فەرمان بەیەك ڕێزیی و هاودەنگی دەکەن، وە ڕێگری دەکەن لەجیابونەوە و ترازان‌و نەیاری. وە فەرمان دەکەن بەهاوکاری و چاکەو پەریزکاری و ڕێگری دەکەن لەهاوکاری لەسەرتاوان‌و دوژمنکاری...

لەم فەرموودەی ابن تیمیەوە دەردەکەوێت کە:

١/حزب به "فرق" دانانرێت مەگەر ئەوەی کە حزب دەمارگیری لەسەر دروست بێت وە حزب ببێتە کەشتیەکەی (نوح) هەرچی تێدابێت ڕزگاری بووە و هەرچی لەو کەشتیەدا نەبێت گومڕاو خنکاوە.

٢/گرنگ یەك حزبی وەیان فرە حزبی نیە، گرنگ ئەوەیە کە حزب ئامێرێك بێت بۆ یەك ریزی موسوڵمانان و گەڕانەوەی فەرمانڕەوایەتی ئیسلام وە هەدەفو ئامانج یەکێك بێت ئەگەر شێوازی کاریش یەك نەبن....

٣/فەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی بریتییە لە:-

أ)یەك ریزی نێوان موسڵمانان.

ب)هاوکاری کردنی یەکدی لەسەر چاکەو پەریزکاری.

ج)دورەپەرێزی لەیەك ترازان و کێشەو دووبەرەکی...

کەواتە حزبە بەمەرجی بەبێ دەمارگیری، وە بەئامێر زانینی حزب وەکو وەسیلەیەك بۆ یەك ڕیزی موسوڵمانان و گەڕانەوەی فەرمانڕەوایەتی ئیسلام. حزب بەم دوو مەرجە بە "فرق" ناژمێردرێت وە تەنانەت بە "تفریق" دانانرێت، بەڵام فرەحزبی لەئیسلامدا هیچ بەڵگەو پاساوێکی نیە.

وە جگە لەناچاریی و ئەمری واقع بەڵگەیەك لەسەر چەند حزبی لەئیسلامدا بوونی نییە. وە دەبێ هەمیشە موسوڵمانان و کەسانی زاناو دڵسۆز بەئیسلام لەهەوڵی یەکگرتنو یەکڕیزی ڕابوونی ئیسلامدا بن وە بەبێ یەك ریزیی، یەك بەیداخی، یەك ئامانجی و هەستو سۆزی برایەتی، نە خوای گەورە لێمان رازی دەبێت وە نەسەربەرزی بۆ ئیسلام و موسڵمانان بۆ ئیسلام و موسوڵمانان دەگەڕێتەوە کە إنشاء الله هەموو هەوڵو کۆششی ئێمە بۆ ئەو یەکڕیزیە دەبێت خوایارو یاوەریێت...

## ((خاڵی هەشتەم))

### هۆکاری سەرهەڵدانی "فرق" و "احزاب" و ڕای جیاواز لەنێوانیان

ئەگەر بەوردی سەرنجێك لەمێژووی ئیسلام‌و ژیانی پێغەمبەری ئیسلام و هاوەڵە بەڕێزەکانی بدەین دەبینین کە لەو سەردەمە زێڕینەدا تا کۆتایی خەلافەتی "راشدة" جگە لە ڕاجیایی ئەویش لەبواری (اجتهاد) کوشـشکاری نە "فرق" و دەستەو تاقم هەبوون.
وە نە ئەو لەقەب‌و نازناوانە هەبوون کە لەپاش ئەوان هەتا ئەمڕۆ شوێنەواریان ماوەتەوە، وەکو "سنە" شیعە" سەلەفی، سۆفی، دەروێش. "جماعە" و لا جماعة" هتد...
بەڵام بەشەهیدبوونی امامی علی کوڕی ابی تاڵب سلام الله علیه. کرم الله وجهه سەرەتای "فرق" سەری هەڵدا، کە ئێمە لەم خاڵەدا هەم هۆکاری سەرهەڵدانی "فرق" و هەم احزابی ئیسلامی و رای جیاواز لەسەریان‌و لەنێوانیان بەدوبەش بەیان دەکەین:
**بەشی یەکەم**: هۆکاری سەرهەڵدان وە ڕای جیاواز لەنێوانیان، هەرچەند لەخاڵەکانی پێشەوەدا ئەوەمان ڕوونکردەوە لەسەر زاری زانایان کە ئەو حەفتاو سێ "فرقە"یە لەفەرموودەکەدا زیادەیەو بەدەست هەڵبەست دەژمێردرێت بەڵام نکۆڵی لەوە ناکەین کە لەمێژووی ئیسلامدا چەند دەستەو تاقمێك سەریان هەڵداوە و بوون وەکو "سنە" شیعە" متعزلة" قدریە" جبریە" وە لێرەدا هۆکارو ڕاجیاوازی نێوان ئەم پێنج دەستەیە دەخەینە بەردیدی خوێنەران، کە لەم پێنج وشەو ئەساسە دەرناچێت.

١-مەسەلەی "امامە" جیٚ نیشنی ئایا لەپاش پێغەمبەری ئیسلام کیٚ شایستەی جیٚ نشینی پێغەمبەرە لەپاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، ابوبکری صدیق یان علی کوڕی ابی تالب ڕەزای خودایان لەسەر بێت کە کێشەی سەرەکی نێوان شیعەو "سنی" دەگەڕێتەوە بۆ ئەم مەسەلە هەستیارە کە زیاتر سیاسیە نەك فقهی وە باقی کێشەکانیان بەئەندازەی "امامە" زۆر گرنگ نین وەیان لەچوار دیواری "اجتهاد" تیٚ ناپەڕن.

٢-تاوانی گەورە جگە لە کفر و شرك "المرتکب الکبیرە" ئایا کەسێك تاوانی گەورە ئەنجام بدات وەکو کوشتن، دزی، شەراب خواردن، زنا، لەهەمان کاتدا نوێژو ڕۆژویش بەجیٚ بهێنیٚ بەکردنی ئەو تاوانانە لەئیسلام دەچێتە دەرەوە و بەهەمیشەی لەدۆزەخدا دەمێنێتەوە؟ یان هەر بەموسڵمان دادەنرێت و بەگوێرەی تاوانەکەی سزادەدریٚو پاشان دەچێتە بەهەشتەوە تاقمی، خەوارج لادەران لەئەهلی سنە جیادەبنەوە بەوەی کە تاوانی گەورە خاوەنەکەی لەچوار دیواری ئیسلام دەردەکاو بەکافر دەژمێردرێت بەلاٚم اهلی سنە دەڵێت: (الکبیرة لاتخرج العبد المؤمن من الایمان ولاتدخله في الکفر؛ (انظر العقیدة الطحاوی والنسفی) ).

واتە: تاوانی گەورە بابای باوەڕدار لەئیمان دەرناکاو نایخاتە ناو بیٚ باوەڕیەوە، وە تاقمی "معتزلە"یش لەسەر ئەم مەسەلەیە لەئەهلی سنەو "خوارج" جیادەبنەوە و دەڵێن: کەسێك کە تاوانی گەورە ئەنجام بدات نە بە"کافر" بیٚ باوەڕ دادەنرێت وە نە

بەباوەڕدار (منزلة بين المنزلين) لەنێوان باوەڕداری و بێ باوەڕیدا دەمێنێتەوە.

٣-ئەو کردارانەی کە مرۆڤەکان دەیکەن لەچاکو خراپ، لەڕەواو ناڕەوا، لەبێ باوەڕیی و باوەڕداری. (افعال العباد من الكفر والايمان والطاعة والعصيان) ئایا بەخواستی خودایە یان بەویستی مرۆڤەکانە، تاقمی قدریەکان دەڵێن بەویستی مرۆڤەکانەو هیچ خواستێکی خودای تێدا نیە. وە تاقمی جبریەکانیش دەڵێن ویستو ارادی مرۆڤەکانی تێدا نیەو هەمووی بەخواستی خودایە.

٤-ئایا باوەڕدار "ایمان" بەبێ کاری چاکە "عمل صالح" خاوەنەکەی لەبێ باوەڕی قوتار دەکات؟ یان کاری چاکە "عمل صالح" مەرجی ئیمانەو بەبێ کاری چاکە باوەڕ وەرناگیرێت، کە تاقمی "مرجئە" لەئەهلی سنە جیادەبنەوە دەڵێن: (لایضر مع الایمان معصیة. ولا تنفع مع الكفر الطاعة). واتە: تاوان لەگەڵ باوەڕدا زیانی نیەو چاکەیش لەگەڵ بێ باوەڕیدا سودی نیە.

٥-ئایا صفاتەکانی خودای گەورە بەشێکن لەزاتی پەروەردگار یان لەزاتی پەروەردگار جودان، ئەشعەریەکان کە بەشێکن ئەهلی سنە دەڵێن: صفاتەکانی خوای گەورە وەکو ( رحمان، رحیم، سلام، عزیز، جبار، متکلم، علیم) نە بەشێکن لەزاتی پەروەردگار وە نە لەزاتی پەروەردگاریش جودان. وەکو "قیام" وەستانی کەسێك بەپێوە کە وەستان "قیام" نە بەشێکە لەزاتی کەسەکە وە نە جودایە لەو کەسەیش بەڵکو صفەتی ئەوە. کە بەمە لەبەشێکی

ئەهلی سنە جودا دەبنەوە، کە ئەمانە ڕیشەی سەرهەڵدانو هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو تاقمو دەستانەن کە لەمێژوودا بە"فرق" ناودەبرێن کە لە ئەمرۆدا ئەو کێشانە بەشی هەرە زۆریان نەماون وەیان زۆر جێگەی بایەخ نین بۆیە تەنها ئاماژەمان پێ کردوون وە لەسەری نەڕۆیشتوین.

**بەشی دووەم**: سەرهەڵدانی ئەحزابی ئیسلامی و ڕای جیاواز لەسەریانو لەنێوانیاندا:

حزب کە بەمانای کۆمەڵێك لەخەڵکی دەوترێت، وە هەر گەلو تایەفەیەك کە لە کردارو بیرکردنەوەدا هاوشێوەی یەك بن ئەوە پێیان دەوترێت "حزب" هەرچەند هەندێکیان هەندێکی تریانی نەدی بێت. وەکو المنجد فی اللغه داهاتووە: (الحزب جمع احزاب، الجماعة من الناس وکل قوم تشاکلت قلوبهم واعمالهم فهم احزاب وان لم یلق بعضهم بعضاً) کە لەقورئانی پیرۆزدا ئەم وشەیە چەند جار بەتاکو بەکۆ دووبارە کراوەتەوەو خوای پەروەدگاریش کۆمەڵی موسڵمانان و پەیڕەوانی پێغەمبەری ئیسلام بەحزب ناودەباتو بەتاکە حزبی سەرفرازیان دەزانێت لەدنیاو پاشەرۆژدا و دەفەرموێت: (الا ان حزب الله هم المفلحون) المجادله.

واتە: ئاگادار بە کە تەنها حزبی خوای گەورە کە موسڵمانانە بەختیارو سەرفرازن، بەڵام تاوەکو موسڵمانان دەوڵەتو دەسەڵاتیان هەبووە وشەی حزبیان بەکارنەهێناوە و بۆیان بەکارنەهاتووە. وە کە دەسەڵاتو دەوڵەت لەدەستی موسڵمانان سەنرایەوە و ئیسلام و

موسڵمانان لەمەیدانی سیاسەت‌و بەڕێوەبردن دوور خرایەوە و پەرت‌و پەرتەوازەبوون، دووبارە موسڵمانانی بێدارو دڵ زیندو بەمەبەستی کۆکردنەوەی وزەکان، یەك ریزی بۆ پیادەکردنی ئیسلام و شەریعەتەکەی بەناوی حزب و لەژێر سایەی حزبایەتیدا هاتنەوە مەیدان وە لەم کاتەدا موسوڵمانان لەبەرانبەری کاری ئیسلامی بەناوی حزبەوە بونە چوار دەستەو چوار بۆچوونی جیاواز.

کە دکتور صلاح الهادی لەکتێبەکەیدا بەناوی (جماعه المسلمین) لاپەڕە (٧٧) بەم جۆرە باس لەو چوار دەستەیە دەکات‌و دەڵێت: (فمنهم من نازع ١-في شرعية الانضواء في تجمع من هذه التجمعات ابتداءً، ذهابا منه الى ان لاجماعة ولابيعة الا بعد التمكين ونصبة الامام).

٢-ومنهم من غلا فجعل لزوم الجماعه جزءً من اصل الدين لاتثبت صفة الاسلام ابتداءً الا باستفائه، ودان بأن من لم يكن في جماعة كان كافراً سواء كان كفره عناداً وجهلاً.

٣-ومنهم من غلا فقصر جماعة المسلمين على تجمعه الخاص، ولم ير لغيره شرعيه الانتساب الى الاسلام او الجماعة.

٤-ومنهم اذا تلبست بشئ يخالف ما فهمه من اصول اهل السنه والجماعه تمسكا بما أثر عن السلف في هجر اهل البدع والابتعاد عنهم.

واته:

١-هەندێك لەموسڵمانان بەڕەوایان نەدەزانی کە پەیوەندی بەیەکێك لەکۆمەڵی ئیسلامیەوە بکەن و لەگەڵیا کاری ئیسلامی ئەنجام بدەن بەپاساوی ئەوەی کە کۆمەڵە بون‌و پەیماندان بە کەسێك بەناوی

براگەورە دروست نیە مەگەر پاش بەهێزبوونی موسوڵمانان و دانانی پێشەوا بۆیان.
٢-وە هەندێکیان لەم بارەیەوە زیادەڕەویان کردو پابەندبونیان بەکۆمەڵێکەوە بەپارەیەك لەئەساسی دین دەزانی بەجۆرێك کە ئیسلام ناچەسپێت مەگەر بەوەفاداری بۆ کۆمەڵی ئیسلامی نەبێت وە بەسەرزەنشتەوە دەیانوت هەر کەس لەناو کۆمەڵدا کار نەکاتو نەبێت، ئەوە بێ باوەڕە جا بەنکوڵی ، یان بەنەزانی بێت.
٣-هەندێکی تریان زیادە ڕەویان لەوەدا دەکرد کە لایان وەها بوو کۆمەڵی ئیسلامی راستەقینە تەنها ئەوەیە کە خۆیانی تێدایەو تایبەتە بەخۆیان وە کەسێکی تریان بەموسڵمان و کۆمەڵی راستەقینەی ئیسلام بەڕەوا نەدەزانی.
٤-هەندێکی تریان هەر جۆرە نزیك بوونەوە و هاوکاری لەگەڵ هیچ کۆمەڵێکی ئیسلامی یان رەت دەکردەوە و بەڕەوا نەدەزانی ئەگەر شتێکیان بدیایە کە جیاوازە لەگەڵ بۆچوونی ئەواندا کە بەو جۆرەی ئەوان لە ئەساسی سنەو جماعە تێگەیشتون ئەمەیش لەسۆنگەی ئەو فەرمودەیەی سلفی "صالح"ەوە کە دوری گرتنە لەئەهلی "بدعە" و نکوڵی لێ کردنە لەسەریان وەکو وتراوە: (فاعتزل تلك الفرق) خۆ لەو تاقمانە دور بگرە، ئەوەی ماوەتەوە لەم خاڵەدا کە بڵێین ئەمانەن:

یەکەم// فرە حزبی بە "فرق" و دەستەی گومڕاو تیاچو ناژمێردرێن بەمەرجێك لەسەر ئەساسێك لەئەساسە نەگۆڕەکانی

(ئیسلام) جیاوازیان نەبێت. بەڵکو لەشێوازی کارو مەیدانی اجتهادا جیاواز بن.

دکتۆر صلاح الصاوی لەکتێبەکەیدا بەناوی (الثوابت والمتغيرات) لە لاپەڕە (١٩٥)دا دەڵێت: (ان التعدد المقبول فى ساحة العمل الاسلامي المعاصر، هو تعدد التخصص والتنوع وليس تعدد التضاد والتنازع).

واتە: چەند حزبی وەرگێراو لەمەیدانی کاری ئیسلامی هاوچەرخدا ئەوەیە کە لەتایبەتمەندیو شێوازی کار لەیەك جودابن نەك دژی یەكو بەربەرەکانی بێ بەڵگەو مەبەست...

**دووهەم//** گەیشتن بەڕەزامەندی پەروەردگار لەسەر ڕێبازی ئیسلام تەنها لەیەك ڕێگاوە نیە، بەڵکو چەندین ڕێگای هەیە وەکو لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا﴾ (العنكبوت: ٦٩).

واتە: ئەوانەی لەپێناوی ئێمەدا کۆشش دەکەن ئێمەیش ڕێنمایی ڕێگەکانی خۆمانی دەکەین...

**سێهەم//** شێخ الاسلام ابن تيميه لەسەر ئەم فەرموودەیەو شێوازی جیاوازی کاری موسڵمانان، ئەی چوینێت بەیەك ڕێبازی پێغەمبەرانو فرە شەرعی نێوانیان و دەڵێت: (فهذا وامثاله يشبه تنوع شرائع الانبياء فانهم متفقون على ان الله امر كلا منهم بالدين الجامع، وان نعبده بتلك الشرعة والمنهاج. كما ان الامة الاسلامية متفقة على ان الله امر كل مسلم من شريعة القرآن بما هو مأمور به، إما ايجابا واما استجاباً وان تنوعت الافعال في حق اصناف الامة فلم يختلف اعتقادهم ولا معبودهم، ولا اخطأ احد منهم، بل كلهم متفقون على ذلك

يصدق بعضهم بعضاً) انظر مجموع الفتاوى لابن تيميه ج١٩/١٣١
بڕوانه کتێبی (الثوابت والمتغیرات - دکتور صلاح الصاوی).
واته: ئەمەو نمونەی ئەمە لەچەند جۆرو فرە شەرعی پێغەمبەران دەچێت کە هەموو پێغەمبەران بەبێ جیاوازی لەسەر ئەو ڕێبازە بوون کە خوای گەورە بۆ هەر هەموویان فەرمانی بۆ ناردون بەئاینی گشتگیرو هەمەلایەن وە ئێمە بەندایەتی خودا دەکەین بەو دەستورو ڕێبازانە.
هەروەکو چۆن ئوممەتی ئیسلامی یەك دەنگن بەبێ جیاوازی کە خوای گەورە فەرمانی داوە بەهەموو موسوڵمانێك بەپەیڕەوی لەیاساو دەستوری قورئان بەو جۆرەی کە فەرمانی پێ کردووە، جا ئەو فەرمانە پێویستی کردوە لەسەری. وەیان پێی خۆش بووە کە ئەو فەرمانە ئەنجام بدات بەبێ فەرزکردن لەسەری.
هەرچەند شێوازی کارکردن بەفەرمانی پەروەردگار لەلایەن موسڵمانانەوە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازی هەبووە. وە لەدەستەیەکەوە بۆ دەستەیەکی تر جۆراوجۆر بووە. بەلاَم هیچ کات لەباوەڕیان یان لەبەندایەتیان بۆ پەروەردگار، نەیارو جیاوازی یەك نەبوون وە کەسیان بەهەڵەدا نەچون، بەڵکو هەموویان یەك دەنگو یەك ڕا بوون لەسەر باوەڕو بەندایەتیان، وە یەکتریان بەڕاست و ڕاستگۆ زانیوە.
کە لەم فەرمودانەوە ئەوە بەدی دەکرێت کە: فرە حزبی وەیان فرە مەزهەبی وەیان فرە دەستەیی ئەگەر جیاوازیان لەباوەڕو بەندایەتی خودا نەبور وە ئامانجی هەموویان چەسپاندنی شەریعەتی خودا بوو. وە دەمارگیریان تەنها بۆ ئیسلام و پەیامەکەی ئیسلام بوو کە قورئانە ئەوە بە "فرق" و دەرچوو لەئاینی ئیسلام لەقەڵەم نادرین وە لەو پێغەمبەرانە دەچن کە ئاینیان یەکەو شەرعو دەستوریان جودایە..

## ((خاڵی نۆهەم))

## یەك ڕیزی و كاری بەكۆمەڵ لەڕوانگەی قورئان و سنە، تەوە

لەخاڵەكانی پێشودا لەسەر زاری زانایانی ئیسلام ئەو تێبینیانەمان باسكرد كە لەسەر فەرموودەی حەفتاو سێ "فرقه" بەیان كراون وە نكۆڵیان لەوە كرد كە ئەو "فرقانە لەچوار دیواری ئیسلام دەرچووبن بەڵكو هەموویان ئوممەتی پێغەمبەرو پەیڕەوی ئیسلامن. بەلام لەگەڵ ئەمەیشدا ئەوە ناگەیەنێت كە "فرق" و تائفەو، دەستەو، تاقمو، فرەحزبی ڕەوابێت زیانی بەیەك ڕیزی ئیسلام و موسوڵمانان نەگەیاند بێت. بەڵكو بەداخەوە فرە مەزهەبی كە ڕا جیاییە لەمەیدانی اجتهادا لەئاكامی دەمارگیری پەیڕەوانیدا گەیشتووەتە ئەو ئاستەی كە یەكتری بەترازان لەئیسلام و كوشتو كوشتاری لێ كەتووەتەوە. كە لەڕاستیدا هەر جۆرە ڕكابەری‌و، دووبەركی و، تەنانەت ڕاجیای لە غیابی دەوڵەتو دەسەلاتی ئیسلامیدا زەرەرو زیان گەیاندنە بەیەك ڕیزی موسوڵمانان كە ئاكام و ئەنجامەكەی شكستو زەلیلی ئیسلام و موسوڵمانە. وە شتێكی نەگۆڕو چەسپاو هەیە: كە كەلیمەی توحید چەسپاو دامەزراوە نابێت مەگەر بەتوحیدی كەلیمە. ئەمەیش بەیەك ڕیزیی و كاری بەكۆمەڵ دەستەبەر دەبێت. بۆیە بەگونجاوی دەزانین لەم خاڵەدا باس لەیەك ڕیزیی و كاری بەكۆمەڵ بكەین لەڕوانگەی قورئان و "سنە" تەوە.

## یەکەم:- مانای جماعە

وشەی "جماعە" وەرگیراوە لە (اجتماع) کە دژی ئەم وشەیە "تفرق" و لێك ترازانە، وتراوە: (اجمع امره ای جعله جمیعاً بعد ماکان متفرقا) واتە: کارەکانی کۆکردەوە و ڕێکی خستن پاش ئەوەی کە پەرتەوازە بووە.

کەواتە کۆبونەوە یان کاری بەکۆمەڵ سێ جۆرە:

١-کۆبونەوەی خەڵکی لەمزگەوتدا یان لەکێوی عەرەفەدا بۆ ئەنجامدانی فەرمانی خوای گەورە و بەندایەتی کردنی. کە ئەمە پێی دەوترێت "حسی" هەستیارو لەبەرچاو.

٢-کۆبونەوەی گەل لەسەر باوەڕبوون بەخوای گەورە و پێغەمبەرەکەی و خۆ قەدەغەکردن لەو تاوانانەی کە ئاشکراو پەنهانن، ئەمە پێی دەوترێت "معنوی" واتە نادیار و هەست پێ نەکراو.

٣-کۆبونەوەی خەڵکی لەدەوری ڕابەرو پێشەوایەکدا لەسەر ئاساسی پاراستنی دین و بەڕێوەبردنی کاری دنیادا، کە ئەمە پێی دەوترێت "سیاسی" ڕامیاری، کە چەند کۆمەڵ و کۆبونەوەی جۆراو جۆری ترهەن لەم بارەیەوە. بڕوانە کتێبی (جماعة المسلمین) دکتور صلاح الصاوی لاپەڕە (١١).

## دووهەم:- یەك ڕیزی لەدیدگای قورئانەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ﴾ (آل عمران: ١٠٣).

واتە: دەست بگرن بەپەیامی پەروەردگارەوە بەکۆمەڵ. وە لەیەك مەترازێن لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾ (النساء: ١١٥). واتە: هەر کەسێ سەرپێچی لەفەرمانی پێغەمبەر بکات لەو پەیامەی کە بۆی ڕەوانەکراوە و بە "معجزة" ڕۆشن بووەتەوە و لەپاشان پشتی تێ بکاتو بکەوێتە سەر ڕێگاو ڕێبازێك جیاواز لەڕێگاو ڕێبازی باوەڕداران ئەوە، ئێمەیش لێ دەگەڕێین با لەسەر ئەو ڕێبازە لارو چەوتە بڕوات وە دەیخەینە ناو دۆزەخەوە کە خراپترین ئاکام و گەڕانەوەیە. بڕوانە تەفسیری (صفوة التفاسیر – ج١ ، ص٣٠٥) .

لەم دوو ئایەتە پیرۆزەوە ئەمانەمان بەدەست دەکەوێت:

ا ) پابەندبوون بەپەیامی پەروەردگار بەکۆمەڵ و یەکپارچەیی.

ب) هەڕەشەکردن لەهەر جۆرە ڕکابەری و دووبەرەکی و، پەرتەوازەیی.

ج) گوێڕایەڵی بۆ ئەو فەرمانو دەستورانەی کە پێغەمبەری ئیسلام بۆی هێناوین بەڕاستی و ڕەوانی.

د) شوێنکەوتنی ڕێگەو ڕێبازی باوەڕداران کە یەك ڕێگەو ڕێبازن.

ه) هەڕەشەی دۆزەخ لەسەرپێچیکەرانو لادەران لەڕێگای باوەڕداران کە باوەڕداران یەك کۆمەڵو یەك ڕیزن...

## سێهەم:- کاری بەکۆمەڵ و یەکریزی لەدیدگای سنەتی پێغەمبەرەوە ﷺ.

پێغەمبەری خودا دەفەرموێت: (وانا آمرکم بِخَمسٍ امرنی الله بهن: الجماعة والطاعة والهجرة والجهاد في سبيل الله، فان من فارق الجماعة قيد شبر فقد خلع الاسلام من عنقه الا ان يراجع) اخرجه احمد واورده الالبانی فى الجامع الصغير ١٧٠. وقال الحديث صحيح الاسناد بلا شكَ.

واتە: من فەرمانتان پێ دەکەم بەپێنج شت کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوم:

١-بونی کۆمەڵ و کاری بەکۆمەڵ.

٢-گوێرایەڵی بۆ خوداو پێغەمبەرو فەرمانڕەوا لەخۆتان.

٣-کۆچ کردن.

٤-تێکۆشان لەرێگەی خودادا.

٥-جودا نەبوونەوە.

لەکۆمەڵی موسوڵمانان کە بەڕاستی هەر کەسێك لەکۆمەڵی موسوڵمانان بەئەندازەی بستێك جودابێتەوە. ئەوە ئیسلامی لەئەستۆی خۆی داڕنیوە مەگەر ئەوە بگەڕێتەوە. امام احمد ئەم فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە....

لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەفەرموێت: {عليكم بالجماعة واياكم والفرقة، فان الشيطان مع الواحد وهو مع الاثنين ابعد، من اراد بحبوحة الجنة فليلزم الجماعة} (حديث صحيح، اخرجه الترمذی عن عبدالله بن دينار وهو جزء من خطبة امير المؤمنين عمر بن الخطاب بالجابية بالشام) ....

واته: لەسەرتان پێویستە بونتان بەکۆمەڵ، وە خۆتان بپارێزن لەپەرتەوازەیی و لێکترازان، چونکە بەڕاستی شەیتان لەگەڵ کەسێکدایە کە بەتەنها بێت، بەڵام لەگەڵ دواندا دوور دەکەوێتەوە، ئەگەر کەسێك خوازیاری ناوەڕاستی بەهەشتە باپابەند بێت بەکۆمەڵی موسڵمانانەوە، ئەم فەرموودەیە بەشێکە لەوتاری عمری کوڕی خەتاب کە لەشامدا وتویەتی. وە امامی ترمذی گێڕاویەتیەوە کە فەرموودەیەکە لەعبدالله ی کوڕی دینارەوە گێڕاویەتیەوە بەڕاست و دروستی دەزانێت.

هەروەها عمری کوڕی خەتاب ڕەزای خودای لەسەر بێت دەفەرموێت: (لا اسلام الا بجماعة ولاجماعة الا بامارە ولا امارە الا بطاعة).

واته: ئیسلام بەهاو مانایەکی نیە مەگەر بەکۆکردنەوە و کاری بەکۆمەڵە وەکۆمەڵیش دەورێکی نیە مەگەر بەبونی فەرمانڕەواو سەرکردە. وە سەرکردەیش بەبێ گوێڕایەڵی هێزو پێزێکی نیە...

## چوارەم:-

## خوای پەروەردگار لەپەیامەکەیدا کە قورئانە فەرمانی بەموسوڵمانان داوە کە پارێزگاری لەپێنج شتی سەرەکی بکەن کە ئەمانەن:

١-دین " بیروباوەڕ" . ٢- "ڕوح" گیان . ٣-ماڵ و سامان.

٤-"عقل" هۆش. ٥-ناموس "نسل" و نەوە. کە بنەماو ئەساسی شەریعەتی ئیسلام لەسەر ئەم پێنج شتە دامەزراوە و ئامانج لەڕەوانەکردنی پەیام و هاتنی پێغەمبەران پاراستنی ئەم پێنجەیە.

ئەمەیش لەڕێگای فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە. کە لەم بارەیەوە فەرمودەی خودا و پێغەمبەر زۆرن.

وە پاراستنی ئەمانە لەڕێگای فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەوە نەبێت ئەنجام نادرێت. کە بێگومان فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە بەبێ هێزو دەسەلاَت دەستەبەر نابێت. کەواتە هەوڵدان بۆ کۆبونەوەو کاری بەکۆمەڵ و هێزو دەسەلاَت. واجبێکە لەواجبەکانی ئیسلام لەسەرمان. کە وەکو نوێژو ڕۆژو لەسەرمان فەرزەو دەبێ کارو کۆششی بۆ بکەین. کە لێرەدا ئاماژە بەفەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەکەین لەگەڵ ڕاڤە"تفسیر"ی زانایەکی بەرزی ئیسلام لەسەر فەرموودەکە.

کە ئەمەیە: {قال الامام احمد بن حنبل في المسند عن عبدالله بن عمر وان النبي ﷺ قال: لايحل لثلاثه يكونون بفلاة من الارض الا أمّروا عليهم احدهم} ثم قال شيخ الاسلام ابن تيميه في شرح هذا الحديث. فأوجب النبي ﷺ تأمير الواحد في الاجتماع القليل العارض في السفر. تنبيهاً بذلك على سائر انواع الاجتماع. ولان الله تعالى اوجب الامر بالمعروف والنهي عن المنكر ولايتم ذلك الا بقوة وامارة. وقال ايضاً: يجب ان يعرف ان ولاية امر الناس من اعظم واجبات الدين، بل لا قيام للدين الا بها فان بني آدم لاتتم مصلحتهم الا بالاجتماع لحاجة بعضهم الى بعض ولابد لهم عند الاجتماع من رأس، يرأسهم (انظر كتاب: السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعيه ابن تيميه، ص١٦١) ).

واتە: ڕەوانیە بۆ سیٚ نەفەر کە لە بیابانیٚکدا بن لەسەر زەویدا مەگەر ئەوەی کە یەکێکیان ئەمیر بێت بەسەر دوانەکەی تردا. ابن تیمیە دەڵێت: پێغەمبەری ئیسلام ﷺ واجبی کردووە لەسەر ئەو کۆمەڵە بچوکەو کەمە لەسەفەردا کە دەبیٚ ئەمیرێکیان هەبێت. کە ئەمە هۆشداریە بۆ باقی کۆمەڵو کۆبونەوەکان کە دەبیٚ رابەرو پێشەوایان هەبێت. چونکە خوای گەورە بەواجبی داناوە لەسەر موسوڵمانان کە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە بکەن کە ئەم فەرزو واجبەیش تەواو نابێت مەگەر بەهێزو دەسەڵات نەبێت. وەدیسان دەڵێت: پێویستە ئەوە بزانرێت کە بەڕێوەبردنو فەرمانڕەوایەتی خەڵکی لەلایەن خودی موسوڵمانانەوە لەگەورەترین فەرزو واجباتی دینە وە تەنانەت دین ناچەسپیٚو بەرپا نابێت بەوە نەبێت. چونکە بەڕاستی ئادەمیزاد بەرژەوەندی و دەستاوەرەکانیان بەدەست نایەت. مەگەر بەکۆمەڵو کاری بەکۆمەڵ نەبێت چونکە پێویستیان بەیەکتری هەیە. کەواتە بۆ ئەو کۆڕو کۆمەڵەیەیان سەرو سەرکردەیەکیان پێویستە. بڕوانە کتێبی سیاسەتی شەرعی ابن تیمیە لاپەڕە ١٦١...

## (( خاڵی دەهەم و کۆتـایی ))

## دەوری ئێمە لەم رۆژەدا چی دەبێت

ئێمەی موسوڵمانان یاخود بڵێین ئێمەی زاناو بانگخوازو خەمخۆرو، دڵسۆزی ناو ریزو کۆمەڵی موسوڵمانان لەوەها رۆژێکدا کە تێیدا دەژین پێویستمان بەرەچاوکردن و پەیرەوی لەدوبابەتە: یەکەم (فقهی دین) دووەم (فیقهی واقع)ە.

کە لەپاش تێگەیشتن لەم دوانە (١٠)دە شت دەکەینە ئەساس و بنەما بەمەبەستی ئەنجامی ئەرکی سەرشانمان و گەیشتنمان بەئامانجی دنیا و دوارۆژمان، بەیاری خودای پەروەردگار.

### یەکەم: (فقهی دین)

واتە ئاشناو شارەزا و تێگەیشتنمان لەو ئیسلامەی کە ئێمە پەیرەوی لێ دەکەین. وە هۆکاری بەختیاری هەردوو دنیامانە کە بێگومان سەرچاوەی دینمان. وە سەرچاوەی زانستمان بۆ دین و بیروباوەڕەکەمان، یەکەم: قورئانەو دوهەم فەرمودەو مێژووی پێغەمبەرەکەمانە ﷺ هەرچەندە زۆر کەس ئەمە دوبارە دەکاتەوە کە گەڕانەوەمان بۆ قورئان و سنە تەنها چارەسەری کێشەکانمانە. وەیان قورئانو سوننە تەنهاو تاکە سەرچاوەی دەستورمانە. بەلام ئایا تاچەند ئەم دروشمە پیرۆزە چەسپاو و جیگیر بووە؟ کە بەداخەوە هێشتا لە قۆناغی یەکەمو سەرەتای رێگەداین، چونکە:

١-ئەم دروشمەمان لەخۆماندا جێبەجێ نەکردووە بەپێی پێویست تا خەڵکی لەئێمەوە ئیسلامی لاخۆشەویست بێ و بەدڵی ئاسودەیی هەوڵی جێبەجێ کردنی بدات.
٢-ئێمە لەسەرچاوەی قورئان‌و سوننەتەوە راستەوخۆ تێرئاو نەبووین. وەڕاستەوخۆ دەستوراتمان لێ وەرنەگرتووە.
٣-ئێمە لەڕێگای "فرقە" "مذهب" حزب ، کەسایەتی ناودارەوە ئەویش بەشێوەی "تعصب" دەمارگیری ویستومانە لەشەرع‌و شەریعەتی ئیسلام تێ بگەین وەیان سەقامگیری بکەین کە هەریەکێك لەمانە هۆی نەزانینی زۆرێك لەپەیڕەوانیان دیوارو ڕێگریان لەناو موسڵماندا دروست کردووە. یان خۆیان لەقاڵب دراون‌و لەبازنەیەکی تەسکدا دەخولێنەوە.
٤-لەباتی ئەوەی کە ئەمانە وەسیلەو ئامێرین بۆ ئیسلام و چەسپاندنی شەریعەتی خودا بێتە ئامانج کەچی بەداخەوە زۆرجار ئیسلام کراوەتە وەسیلەو ئەوان بونەتە ئامانج‌و "هدف"...
کەواتە تێگەیشتنی ئێمە لەفقهی دین ئەوەیە کە بۆ دین بژی وە شەریعەتی خودا بەرزو بەرێز ڕابگرین، نەك دین بکەینە وەسیلەی ژیان‌و دەرکەوتنی ناومان. وەکو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە بەو جۆرە تێگەیشتن‌و ژیان لەپێناوی ئیسلام‌و سەرەنجام بەڕەزامەندی پەروەردگار شادمان بوون (رضی الله عنهم ورضوا عنه)....

**دوهەم: (فقهی واقع)**

ئێمەی خەمخۆری ئیسلام چەندە پێویستمان بە (فقهی دین) هەیە ئەوەندەیش ئاتاج و پێویستمان بە (فقهی واقع) دەوری رۆژگار هەیە یان بڵێین (باری نوێ) تێگەیشتن لەباری نوێ ئەوەیە کە بزانیت:

١-ئەو رێکخراو، حزب و، دەستەو تاقمانەی کە لەدەوروبەرتدا دەژین چین و کێن؟

٢-ئەو دەوڵەتەی کە تۆ لەژێر سایەیدا دەژیت چۆن دەوڵەت و دامودەزگایەکە؟

٣-دەردو ئاسۆری موسوڵمان لەکام ڕووی ژیانەوەیە.

٤-لەکام بابەتی ئیسلامیدا موسوڵمانان لەناو خۆیاندا لەسەری ناکۆکن

(أ-سیاسی.

ب-فکری.

ج-مەزهەبی.

د-قەومی.

هـ-اقتصادی.

و-اجتماعی.

ز-تربوی.

ح-ثقافی).

٥-دوژمن و دۆستی راستەقینەی موسڵمانان کێن و کامانەن...

کە ئەمانەت زانی ئەوسا بەئاسانی دەتوانی هەنگاوی سەرکەوتوانە بۆ چارەسەرکردنی هەڵێنی. کە ئەمە بەکورتی تێگەیشتنە لەفقهی واقع...

ئەمەیش ئەو ١٠ ئەساس و بنەمایەی کە دەبێ لەبەرچاو بگیرێت:-

**١-الجماعة والوحدة سبيل النجاة، والفرقة سبيل الهلاك.**

کۆمەڵ و یەکریزی رێگای سەرفرازیەو لێکترازان و پەرتەوازەی رێگای تیاچوون و ژێردەستەییە.

**٢-من منهاج الجماعة الرحمة بالمسلمين وحب الخير لهم ونصيحتهم بقصد نفعهم**

لەرێبازی کۆمەڵە سۆزو بەزەیی بەموسوڵمانانندا، خۆشەویستی چاکە بۆیان و ئامۆژگاریان بەمەبەستی سودگەیاندن پێیان.

**٣-لايحل لاحد ان ينزل فرقة او طائفة من المسلمين موافقه او مخالفة جنةً ولا ناراً، ولا يشهد لها بمطلق الايمان او النفاق.**

بۆ هیچ کەس ڕەواو حەڵاڵ نیە کە دەستەیەك یان تاقمێك هاوڕات بێ یان ڕاجیا بێت لەگەڵ تۆدا کە بەئەهلی بەهەشت یان دۆزەخی ناوزەدی بکەیت وە نابێت بەڕەهای شایەتی باوەڕداری یان دوڕوی لەسەر بدەیت.

**٤-حصر الاختلاف في دائرة الفروع والمسائل الاجتهادية**

قۆرخ کردنی جیاوازیەکان لەبازنەی بەش و مەسەلە اجتهادیەکاندا.

٥-بقاو الالفه والعصمه واخوه الدين.

پاراستن و مانەوەی پێکەوە ژیان‌و پابەندبون‌و برایەتی ئیمانی.

٦-وحده الموقف السياسى والجهادى.

یەك هەڵوێستی لەمەیدانی سیاسی و جیهادیدا.

٧-احياء مفهوم الامة وتجديد الولاء للجماعة بمفهومها العام الشامل.

زیندوکرنەوەی مانای کار بۆ هێنانەوەی ئوممەتی ئیسلامی.

و تازەکردنەوەی پەیمان‌و لایەنگری بۆ کۆمەڵی موسوڵمانان بەمانا گشتی و گشتگیریەکانی.

٨-تربية الافراد على ان الولاء للاسلام يجب ان يسبق الولاء لكل ماسواه. وتبينهم على خطر عقد الولاء والبراء على ماهو انقص من اخوة الدين.

پەروەردەکردنی یەکەو تاکی کۆمەڵ لەسەر ئەوەی کە لایەنگری بۆ ئیسلام پێویستە پێش لەهەر لایەنگریەکی تربێت وە ئاگاداریدان پێیان لەسەر پەیمانی هەواداری و لایەنگری لەسەر شتێك کە کەمتر بێت لەبرایەتی ئیمانی.

**٩-انتصاب طائفة من صالحي المؤمنين لاستنفار اهل الحل والعقد وانهاضهم للقيام بامانة القيادة وامامه الجماعة، وتجديد ماتقطع بينهم من الصلات والوشائج.**

دانانی دەستەیەك لەپیاوچاكان بۆ جاڕدان بەمەبەستی دروستكردنی ئەهلی حەل و عقد وە ڕاپەڕاندنیان بەهەستان بەڕابەرایەتی كردنی موسوڵمانان و هەڵگری ئەمانەتی ئیسلام و دامەزراندنی كۆمەڵی موسوڵمانان وە تازەكردنەوەی پەیوەندیەك كە لەنێوانیاندا پچڕاوە بەهۆی دوری لەیەكتری....

**١٠-تاسيس لجان مشتركة للتشاور رفض الخصومات.**

دامەزراندنی لیژنەی هاوبەش بۆ وتووێژو وەلانانی دووبەرەكیەكان..

لەكۆتاییدا لەخوای پەروەدگار داواكارم كە ئەم هەوڵەمان لێ وەربگرێ و لەهەڵەكانم ببورێت، وە چاومان ڕوون بكاتەوە بەدەوڵەتی ئیسلام و فەرمانڕەوایەتی موسوڵمانان.

واخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين

**محمدی رازی سلێمانی**

٢٠١٠/٤/١٤

# سەرچاوەکان


١-الغنيه عبدالقادر كيلانى.

٢-صحيح البخاري.

٣-المفصل: ابن حزم الاندلسي.

٤-العواصم والقواصم: ابن الوزير اليمانى.

٥-فتح القدير، محمد على شوكانى.

٦-معالم السنن: ابو سليمان الخطابي.

٧-منهاج السنه: ابن تيميه.

٨-الموافقات: الشاطبى.

٩-مختار الصحاح.

١٠-صحيح مسلم.

١١-مختصر تفسير ابن كثير: بان كثير.

١٢-اضواء على حديث التراق الامة: عبدالله بن يوسف الجديع.

١٣-مجموع الفتاوى: ابن تيميه ٣ - ٣٤٦-٣٤٧.

١٤-العقيدة الطحاوى: الامام الطحاوى.

١٥-جماعة المسملين: دكتور صلاح صاوى

١٦-الثوابت والمتغيرات: دكتور صلاح صاوى

١٧-صفوة التفاسير: على صابونى

١٨-السياسة الشرعية: ابن تيميه.